نـــــاوی کتـێـــــب : دایکـانی ئیمانداران
نـــــاوی نوســــــەر: سـیروان حامد رحیم
چاپ و بڵاوکردنــــەوەی: نوســـینگەی تەفـــسیر بـــۆ بڵاوکردنـــەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر
نەخـــشەســـازی نـــاوەوە: عزالدین محمد عمر
خــــــــــــــەت: نـــەوزاد کۆیـــی
بـــــــــــــــەرگ ئەمیـن مخلـص
:نـۆرە و ســاڵی چـــاپ: یەکەم ١٤٣٣ك – ٢٠١٢ز
تـــیـــــــــــراژ: ١٥٠٠ دانە



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن (٢٠٢٧) ساڵی (٢٠١١) پێدراوە

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ۗ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ
بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ
إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ
مَسْطُورًا ﴿٦﴾ ﴾ الأحزاب

# پێشکەشە بە

ئـــەو خوشـــك‌و بـــرا بەڕێزانـــەی کـــە خێزانـــەکانی پێغەمبـــەری خـــوا صـــلی الله علیـــه وســـلم بـــە دایکـــی خۆیان دەزانن.

# پێشەکی

إنَّ الحمدَ لله نحمدُه ونستعينه ونستغفرُه ونعوذُ بالله من شرور أنفسنا وسيئاتِ أعمالنا إنه من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدًا عبده ورسوله.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب

أما بعد؛ فإنَّ أصدقَ الحديث كتابُ الله تعالى، وخيرَ الهدي هَديُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم، وشرَّ الأمور محدثاتها، وكلَّ محدثة بدعة، وكلَّ بدعةٍ ضلالة، وكلَّ ضلالةٍ في النار.

اللَّهمَّ صَلِّ على مُحَمَّدٍ وأزْوَاجِهِ وذُرِّيَّتِهِ كَما صَلَّيتَ على آلِ إبراهيمَ وبَارِكْ على مُحَمَّدٍ وأزْوَاجِهِ وذُرِّيَّتِهِ كَمَا بَارَكْتَ على آلِ إبراهيمَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجيدٌ[1].

---

١) رواه البخاري: (٣٣٦٩)، ومسلم: (٩٣٨).

خوێنەری بەڕێزو سەنگین:

ئەم کتێبەی بەردەستت بەناوی (دایکانی ئیمانداران) پاش هەوڵو کۆششو گەرانێکی زۆر بەنێو سەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا نووسراوە، هەوڵێکە بۆ ئاشنابوونی زیاتری بەڕێزت بە ژیان و بەسەرهات و پلەوپایەی بەڕێزترین و گەورەترین ئافرەتانی سەرزەوی، ئەو ئافرەتانەی، کەخێزانی پێغەمبەربوون صلی الله علیه وسلم کە سەروەرو سەرداری مرۆڤایەتیە، ئەو ئافرەتانەی کە خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بە (دایکانی ئیمانداران) ناوی هێناون ...

ئەم کتێبە جگە لەم پێشەکی یە پێکهاتووە لەم بابەتانە:

تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ژنهێناندا.

تایبەتمەندیەکانی خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

فرەژنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

ژیاننامەی هەر سێزدە خێزانەکەی پێغەمبەری سەروەرمان صلی الله علیه وسلم:

١- (خديجة)ی کچی (خويلد) خوای لێ ڕازی بێت.
٢- (سودة)ی کچی (زمعة) خوای لێ ڕازی بێت.
٣- عایشەی کچی ئەبوبەکر خوای لێیان ڕازی بێت.
٤- (حفصة)ی کچی (عمر)ی کوڕی (الخطاب) خوایان لێ ڕازی بێت.
٥- (زينب)ی کچی (خزيمة) خوای لێ ڕازی بێت.
٦- (أم حبيبة)ی کچی (أبو سفيان) خوای لێ ڕازی بێت.
٧- (أم سلمة) خوای لێ ڕازی بێت.
٨- (جويرية)ی کچی (الحارث) خوای لێ ڕازی بێت.
٩- (زينب)ی کچی (جحش) خوای لێ ڕازی بێت.
١٠- (صفية)ی کچی (حيي) خوای لێ ڕازی بێت.
١١- (ميمونة)ی کچی (الحارث) خوای لێ ڕازی بێت.

پاشانیش هەردوو كەنیزەكەكەی بەناوی (ريحانة)و (مارية).

لەم كتێبەدا هەوڵم داوە بەكورتی تیشك بخەمە سەر ژیاننامەو فەزڵ وپلەو پایەیان لەسۆنگەی فەرمووده (صحیح)ەكانەوە، ئەگینا ژیاننامەو ڕۆڵی گرنگی هەریەكێك لەم ئافرەتە پایە بەرزانە گەر بەجیا باس بكەین ڕەنگە بە (مجلد)ێكیش تەواو نەبێت بەتایبەت دایكە (خديجة)و (عائشة)و (أم سلمة)و (زينب)ی كچی (جحش).

هەروەها خۆم پاراستوە لە هەموو ریوایەتە لاوازو هەڵبەستراوو بێ سەنەدەكان، هەندێ جاریش بەئەنقەست ریوایەتی لاوازو هەڵبەستراوم باسكردووە بۆ ئەوەی خوێنەر لێی بەئاگابێت.

بەهەمان شێوە خۆم بەدوور گرتووە لە شیكردنەوەو باسكردنی ئەو ڕووداوە مێژووییانەی لەسەردەمی دایكانی ئیمانداراندا ڕوویانداوە – لە هەندێ شوێنی پێویستدا نەبێت- بۆ وێنە ڕووداوی (جمل)و (صفين)و... هتد. چونكە ئەوەندەی من ئاگاداربم زۆرێك لە خوێنەرانی ئەمڕۆ ئارەزووی خوێندنەوەی كتێبی قەبارە گەورە ناكەن ! ئەمە لەلایەك لەلایەكی تریشەوە ڕەنگە وروژاندنی ئەو ڕووداوانە لەم ڕۆژگارەدا سوودێكی ئەوتۆی نەبێت.

لەكۆتاییدا داواكارم لەخوای گەورە ئەم كتێبە ببێتە مایەی بەرچاو ڕوونی بۆ خوێنەرانی بەتایبەت دایكانو خوشكانی بەڕێزمان، بەڵكو هەڵسوكەوتو هەڵوێستو ئاكارە بەرزەكانی (دایكانی ئیمانداران) ببێتە مایەی سوودو كەڵكو پەند لێوەرگرتنو، پارسەنگێكی قورسیش بێت لەتای تەرازووی خێرو چاكەكانی نووسەریشدا، آمین.

سبحانك اللهمّ وبحمدك أشهد أن لا إله إلاّ أنت أستغفرُك وأتوبُ إليك.

Sirwanhamed١٣@yahoo.com

هەڵەبجەی تازە

١٦ شوال ١٤٣١ - ١٦ أيلول ٢٠١١

# تایبەتمەندیەكانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ژن هێناندا

**تایبەتمەندی یەكـەم: ژن هێنـان لە چـوار زیـاتر**

**یەكێك لە بەڵگەكـانی ئەم تایبەتمەندیەش:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ وَٱمۡرَأَةٗ مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةٗ لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۗ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ۝٥٠ ﴾ الأحزاب

**لەم ئایەتەدا خـوای گـەورە حـەوت جـۆر ژنـی بـۆ پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم حـەڵاڵ كردووە:**

**یەكـــەم:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ ﴾، **واتـە: ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئێمە ئەو ژنانەمان بۆ حەڵاڵ كردوویت كە مارەییت پێ بەخشـیون.**

**دووەم:** ﴿ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ﴾، **واتـــە: هـــەروەها ئـــەو كەنیزەكانەی كە لەجەنگدا دەستكەوتوون یان بەهەر جۆرێكی تر.**

**سـێیەمو چـوارەم:** ﴿ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ ﴾، **هـەروەها كـچانی مامـتو، كچانی پوورت (خوشـكەزای باوك).**

پێنجــــەمو شەشـــــەم : ﴿ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ ﴾،
هەروەها کچانی خاڵتو کچانی پوورت (خوشکەزای دایك، واتە: بني زهرة) ئەوانەی لەگەڵ تۆدا کۆچیان کردووە.

حەوتــەم: ﴿ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا ﴾،
هەروەهــا ژنێکی بڕوادار ئەگەر خۆی پێشکەشی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بکات، ئەگەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ویستی هەبێ مارەی بکات.
جا خوێنەری بەڕێز

یەکێك لەو تۆمەتانەی کە ناحەزانی ئیسلام ئاڕاستەی پێغەمبەری پێشەوای صلى الله عليه وسلم دەکەن تۆمەتی چەند ژنی، گوایە ئەو جۆرە ژنهێنانە لەبەر ئارەزووی سێکسو شەهوەت دامرکاندنەوە بووە، جا لێرەدا پاساوو حیکمەتەکانی چەند ژنەیی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەخەینە ڕوو تا تەمی ئەم تۆمەتەش بە تیشکی خۆری حەقیقەت بڕەوێتەوە:

١- نەبوونی مەترسی ستەم کردن (إنعدام خوف الجور):

ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆیە سنووری بۆچەند ژنیی دیاری کردووەو لای سەرووی بە چوار ژن داناوە، چونکە لەو ژمارەیە زیاتر بوونی مەترسی غەدرو ستەم بەدیدەکرێت، بەڵام پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم وەك هیچ کەسێکی تر نیە بەڵکو لوتکە (قمّة)ی دادوەریەو ئەو مەترسییەی لێ چاوەڕوان ناکرێ، سەرەڕای ئەوەش لەلایەن خوای کاربەجێ وە پارێزراو (معصوم)ە.

٢- گەیاندنی ئەحکامەکانی شەریعەت:

دایکانی ئیمانداران ڕۆڵی گەورەیان هەبوو لە گواستنەوەی بارو ڕەوشتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلمو هەروەها بۆ گەیاندنی ئەو ئەحکامانەی، کە تایبەتن بەخودی ئافرەتانەوە یان بەئافرەتو مێردەکانیانەوە، ئەم کارەش

کاتێك کامڵ تر دەبێت کە لەڕێگەی چەند خێزانێکەوە بێت ئەگەر یەکێکیان شتێك نەزانێت یان بیری بچێتەوە ئەوی تریان دەیزانێتو بیری دێتەوە.

٣- چاو لە پێغەمبەر کردن صلی الله علیه وسلم:

فرمژنیی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەرخستنی شێوازی کردەیی (عملي)یە بۆ مامەڵەکردنی پیاوی موسڵمان لەگەڵ خێزانی، یان خێزانەکانی بەوشێوەی، کە ئیسلام پێی ڕازییە مامەڵە بکات، گومانی تێدا نیە، کە جێبەجێکردنی ئەو شێوازە کرداری (عملي)یە کامڵ ترو چاکترە کاتێك ژمارەی خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە یەكو لە چوار زیاتر بێت، بەتایبەتی جیاوازییان لەڕووی تەمەنو ڕەچەڵەكو سیفاتو میزاجو خوێندەوارییەوە، کە لە دواییدا پشت بەخوا باسیان دەکەین.

٤- پەیوەندی ژن هێنانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە واتاو چەمکەکانی ئیسلامەوە.

بۆ نموونە ژنێك مێردەکەی لەپێناوی خوادا شەهید دەبێ بە تەنها دەمێنێتەوە باشترین دڵنەوایی و خەڵات بۆی ئەوەیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیخوازێت.

**تایبەتمەندی دووەم: ژنهێنانی بەبێ بوونی سەرپەرشتیار (الولي).**

قسەی هەندێ لەزانایان لەمبارەیەوە:

(إبن القیم) دەڵێت: وَرَسُولُ اللهِ صلی الله علیه وسلم لا یَفْتَقِرُ نِکَاحُهُ إلی وَلِيّ.

واتە: ژن هێنانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێویستی بە سەرپەرشتیار نیە.

وَقَالَ ابْنُ عَقِيلٍ: ظَاهِرُ كَلَامِ أَحْمَدَ أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم لَا يَشْتَرِطُ فِي نِكَاحِهِ الْوَلِيَّ وَأَنَّ ذَلِكَ مِنْ خَصَائِصِهِ[1].

(إبن عقيل)يش دەڵێت: ڕواڵەتی وتەی پێشەوا (أحمد)یش ئەوەیە کە لە ژنهێنانی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بوونی سەرپەرشتیار بە مەرج نەگیراوە.

(إبـن العربـي)یـش دەڵێـت: (... وَهُوَ أَنَّ لِلْوَلِيِّ النِّكَاحَ، وَإِنَّمَا شُرِعَ لِقِلَّةِ الثِّقَةِ بِالْمَرْأَةِ فِي اخْتِيَارِ أَعْيَانِ الْأَزْوَاجِ، وَخَوْفِ غَلَبَةِ الشَّهْوَةِ فِي نِكَاحِ غَيْرِ الْكُفْءِ، وَإِلْحَاقِ الْعَارِ بِالْأَوْلِيَاءِ، وَهَذَا مَعْدُومٌ فِي حَقِّ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم[2]، واتە: بەشوودانی ئافرەت بۆیە دراوەتە دەستی سەرپەرشتیار لەبەر کەمی متمانە بە ئافرەتان لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانیان و، ترسی زاڵبوونی شەهوەت لە شووکردن بە کەسی نەشیاو و، گەیاندنی عەیبوعار بەسەرپەرشتیاران، بەڵام ئەمە لەئاست پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم هەرگیز بەدی ناکرێت.

هەروەها خاوەنی (کشاف القناع)یش دەڵێت: وَ لَهُ صلى الله عليه وسلم التَّزَوُّجُ بِلَا وَلِيٍّ وَلَا شُهُودٍ ... وَاعْتِبَارُ الْوَلِيِّ لِلْمُحَافَظَةِ عَلَى الْكَفَاءَةِ وَهُوَ فَوْقَ الْأَكْفَاءِ.[3]

واتە: ژن هێنان بە بێ سەرپەرشتیار بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دروستە ... بە مەرج گرتنی (ولي) بۆ پارێزگاریکردنە لە هاوتایەتی، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم لە سەرووی هەموو هاوتاکانەوەیە.

---

١) زاد المعاد: (١٠٢/١).

٢) أحكام القرآن لأبن العربي: (٣٩٥/٦).

٣) كشاف القناع عن متن الأقناع: (٤٧٥/١٦).

**تايبەتمەندى سێيەم: ژن هێنانی بەبێ مارەیی (زواجه بدون مهر):**

زانايان لەسەر پێویست بوونی مارەیی بۆئافرەت یەکدەنگن چونکە خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم جێگیریان کردووە، بەڵام ژن هێنان بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەبێ مارەیی دروستە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿... وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ... ﴿٥٠﴾﴾ الأحزاب، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆت حەڵاڵە ئەو ژنە ئیماندارەی خۆی پێشکەش بەتۆ دەکا (خەولەی کچی حکیم) ئەگەر بتەوێ دەتوانی بەبێ مارەیی نیکاحی بکەی، ئەمەش تایبەتە بەتۆو بۆ بڕوادارانی تر دروست نیە[1].

**تايبەتمەندى چوارەم: ژن هێنانی بەبێ گرێبەستو مارەیی (زواجه بلا عقد ولا مهر):**

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ... ﴿٣٧﴾﴾ الأحزاب، واتە: کە (زید) دەستی لە(زینب)ی ژنی بوویەوەو تەڵاقی دا ئێمە لەتۆمان مارە کرد ...

**تايبەتمەندى پێنجەم: مارەنەکردنی ژنانی خاوەن نامەکان (أهل الكتاب):**

بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دروست نەبووە ئافرەتی بێ باوەڕ (کافرة) مارەبکات گەرچی جولەکەو گاور (واتە: أهل الكتاب)یش بن، بەڵگەی ئەم تایبەتمەندیەش ئایەتی ﴿... وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً ... ﴿٥٠﴾﴾ الأحزاب، ئەمەش لەسەر ڕای بەشێك لە زانایان[2].

---

١) بڕوانە: تفسیر إبن کثیر: (٤٤٢/٦)، تفسير القرطبي: (٢٠٨/١٤)، فتح الباري: (٣٢٦/١٣)

٢) بڕوانە: أحكام القرآن لابن العربي: (٤٣٣/٢)، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي: (٢٠٩/١٤).

**تایبەتمەندی شەشەم: سەرپشککردنی خێزانەکانی:**

پێشەوا (مسلم) لە(جابر)ی کوڕی (عبدالله)وە دەگێڕێتەوە دەڵێ: جارێکیان (أبوبکر) هات ویستی مۆڵەتی هاتنە ژوورەوە لەپێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەرگرێت، بینی کۆمەڵێ خەڵك لەبەردەرگاکەیدا دانیشتوون مۆڵەت بەکەسیان نەدراوە، مۆڵەتی دابە (أبوبکر) چووە ژوورەوە، پاشان (عمر) هات، داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی بەویشدا، بینی وا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مات و بێ دەنگ دانیشتووەو خێزانەکانی بەدەوری دان، (عمر) وتی: ئێستا شتێك دەڵێم پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەهێنمە پێکەنین، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەر چاوت لێ بوایە کچەکەی (خارجة) (واتە: خێزانی) داوای خەرجی لێکردم منیش بۆی هەستام وتۆزێکم لێدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی کرد بەپێکەنین و فەرمووی: (هُنَّ حَوْلِي كَمَا تَرَى يَسْأَلْنَنِي النَّفَقَةَ) (واتە: ئەوەتا ئەوانیش بەچواردەورمدا دانیشتوون و داوای خەرجیم لێ دەکەن).

(أبوبکر) هەستا بۆ (عائشة)و، (عمر)یش هەستا بۆ (حفصة) لێیان بدەن، هەردووکیان بە کچەکانیان دەوت: داوای شتێك لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەکەن کەنییەتی ؟ ئەوانیش وتیان: سوێند بەخوا داوای شتێك لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناکەین کەنەیبێت، پاشان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ماوەی مانگێك یان بیستو نۆ ڕۆژ سەرجێی لێ دورخستنەوە، پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرەکانت

بلّێ: ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاو ڕازاوەییەکەیتان دەوێت وەرن با پێتان ببەخشم‌و بەشێوەیەکی جوان دەستان لێ بەربدەم‌و بەڕێتان کەم. وە ئەگەر خواو پێغەمبەرەکەی و پاداشتی دوا ڕۆژتان دەوێ ئەوە بەڕاستی خوا بۆ چاکە کارانتان – ئەوانەتان ڕازین بەم ژیانە- پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردووە.

ئینجا لە (عائشة)وە دەستی پێکردو فەرمووی: (يَا عَائِشَةُ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَعْرِضَ عَلَيْكِ أَمْرًا أُحِبُّ أَنْ لَا تَعْجَلِي فِيهِ حَتَّى تَسْتَشِيرِي أَبَوَيْكِ)، واتە: ئەی (عائشة) من دەمەوێ شتێك بخەمە بەردەستت ،حەز دەکەم پەلە نەکەیت تا پرسی باوك و دایکت دەکەیت.

(عائشة) وتی: ئەوشتە چیە ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ؟

پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە.

(عائشة) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئایا سەبارەت بەتۆ پرسی دایك و باوکم بکەم ؟!! من خواو پێغەمبەرەکەی و ژیانی ئەو دونیا هەڵدەبژێرم، و داوات لێدەکەم ئەم قسەیەی من نەگێڕیتەوە بۆ هیچ کام لە خێزانەکانت.

فەرمووی: {لَا تَسْأَلُنِي امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ إِلَّا أَخْبَرْتُهَا إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَبْعَثْنِي مُعَنِّتًا وَلَا مُتَعَنِّتًا وَلَكِنْ بَعَثَنِي مُعَلِّمًا مُيَسِّرًا)[1]، واتە: هەر ژنێکیان پرسیارم لێبکات پێی دەڵێم، خوای گەورە منی نەناردووە بێزارکەری خەڵك بم یا ببمە هۆی ئەوەی خەڵکی بێزاری دەربڕێ لەدەستم بەڵکو منی ناردووە مامۆستاو ئاسانکاریم.

---

١) رواه مسلم: (٢٧٠٣).

**تايبەتمەنـدى حەوتـەم: پێغەمبـەر صـلى الله عليـە وسـلم بەشمانـەوە (قسـم)ى لەسەر پێويست (واجب) نەبووە.**

دابەشكردنى كاتەكان بەسەر ژناندا بۆ ئەوكەسانەى زياتر لەژنێكيان هەيە كارێكى زۆر پێويست و گرنگە، بەڵام خواى گەورە ئەم فەرزەى لەسەرشانى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەلگرتووە بەلگەشمان ئەم ئايەتەيە: ﴿ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾ ﴾ الأحزاب.

ڕاقـە: تـۆ دەتـوانى كـاتو سـەرەى هـەركامێك لەژنـەكانت دوابخـەيت، واتـە: ئەگـەر لەسـەرەى ئەويـشدا نەگەڕێيتـەوە لاى، تـۆ گوناهبـار نابيـت، هـەروەها هەركامێكيـشيان نزيـك بكەيتـەوەو بتـەوێ لـەلاى تـۆ بمێنێتـەوە (ئەگـەر چـى سەرەى ئەويش نەبێ)، هەر گوناهبار نابيت، هەروەها ئەوەشيان كەكاتى خۆى بەركەنارت كردبـێ لـە بـەش مانـەوە (قسم)و، بـەڵام ئێستا دەتـەوێ لـەخۆتى نزيك بخەيتەوە، ديسان بۆ ئەوەش هيچ گوناهێكت لەسەر نييە، ئا بەم شێوەيە خواى ميهرەبـان بـۆى ڕوون كرديتـەوە نـزيكترە بـەوەى ژنـەكانت چاويان پێـى گەش بێتو خەفەت نەخۆنو ڕازى بنو بـزانن كە تـۆ بـەش مانـەوە (قـسم)ت لەسەرنييە بۆيان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كاتەكانت بـۆ بەشـكردوون و بەوپـەڕى دادپەروەرييەوە لەگەڵياندا دەجووڵێيتەوە، خواى گەورەش چاك دەزانێ بـەوەى لەدڵەكانتاندا حەشار دراوە لـەكارى ژنـان و مـەيل بـۆلاى هەنـدێكيان، هـەروەها خوا بەئاگاو لەسەر خۆيەو پەلەى سزا ناكات[١].

---

١) تەفسيرى ڕامـان بەدەسـكاريەوە، هـەروەها بڕوانـە تەفسيرى: الطبـري: (٢٠/٢٩٣)، إبـن كثيـر: (٦/٤٤٦) القرطبي: (١٤/٢١٤) تفسيـر السعدي: (٦٦٩).

# تایبەتمەندییەكانی خێزانەكانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

خوای گەورە لەبەر خاتری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێزی ناوە لە خێزانەكانیو بەچەند تایبەتمەندییەك لە ئافرەتانی تر جیای كردوونەتەوە، كە بریتین لەمانەی خوارەوە:

**تایبەتمەندی یەكەم: خێزانەكانی دایكانی ئیماندارانن.**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿... وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ... ﴿٦﴾﴾ الأحزاب، واتە: ژنەكانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دایكانی ئیماندارانن بەژنو پیاوەوە.

ئەم دایكایەتیەش لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا بەرجەستە دەبێت:

١- رێز لێگرتنو بە گەورە تەماشاكردنیان پێویست (واجب)ە.

٢- حەرامی مارەكردنیان.

بەلام لەم دوو خاڵەی خوارەوەدا لەدایكی نەژادی جیا دەبنەوەو وەك ژنانی تر مامەڵەیان لەگەڵ دەكرێت:

١- تەماشاكردنو خەڵوەت لەگەڵیان.

٢- میرات نەبردن لێیان.

**تایبەتمەندی دووەم: لە رۆژی دواییشدا خێزانی پێغەمبەرن صلی الله علیه وسلم.**

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (المرأة لآخر أزواجها)[1]، واتە: ژنان لە رۆژی دواییدا دەبنەوە خێزانی دوا هاوسەری دونیایان، هەر بۆیە

١) السلسلة الصحيحة للألباني: (١٢٨١).

مـارەکردنی دایکـانی ئیمانـداران دوای پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم حەڕام کراوە.

**تایبەتمەندی سێیەم: سزاو پاداشت بۆیان دوو بەرامبەرە.**

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ٣٠﴾ الأحـــزاب، واتـە: ئـەی ژنـانی پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم هەرکـام لـە ئێـوە کـارێکی دزێوی ئاشکرای لێ ڕوویدا دوو بەرامبـەر سـزا دەدرێ، زیـاد لـە ژنـانی خـەڵکی، ئـەوەیش بـۆ خـوا ئاسـانە. هەرکامێکیـشتان گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبەرەکـەی بکاتو کردەوەی چاك ئەنجام بدات ئـەوا پاداشـتی دوو بەرامبـەری ئەدەینـەوەو ڕۆزییەکی باشو بە نـرخی لە بەهەشتدا بۆ ئامادە دەکەین .

**تایبەتمەندی چوارەم: نیشانەیەکی گـەورە بوون.**

عن عِكْرِمَةَ قَالَ: قِيلَ لابنِ عَبَّاسٍ بَعْدَ صَلاةِ الصبْحِ مَاتَتْ فُلانَةُ، لِبَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فَسَجَدَ، فَقِيـلَ لَـهُ أَتَـسْجُدُ هَـذِهِ الـسَّاعَةَ؟ فَقَـالَ: أَلَـيْسَ قَالَ رَسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم إِذَا رَأَيتمْ آيَـةً فَاسْجُدُوا؟ فَـأَيّ آيَـةٍ أَعْظَـمُ مِـنْ ذَهَابِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلى الله عليـه وسـلم[1]؟، واتـە: (عِکْرِمَـة) دەڵـێ پـاش نوێـژی بەیانی وترا بە (ابـن عبـاس) فـلانە خێزانـی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسلم کۆچی دوایی کرد، ئەویش کڕنوش (سجدة)ی برد.

پێی وترا: ئا لەم ساتە وەختەدا (دوای نوێژی بەیانی) کڕنوش دەبەیت؟!

---

١) رواه أبوداود والترمذي، وحسنه الألباني، بڕوانە: صحيح أبي داود للألباني رقم (١٠٥٧).

ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیفەرمووە ئەگەر نیشانەیەکتان بینی کڕنوش (سجدة) ببەن، چ نیشانەیەك هەیە گەورەترو سامناکتربێت لە کۆچکردنی خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم؟!

واتە: مانەوەیان لە دونیادا نیشانەی هێمنیو ئارامیە لەسەر زەویدا، کۆچکردنیشیان نیشانەی دابەزینی سزاو ئەشکەنجەیە بۆسەر مرۆڤەکان[1].

**تایبەتمەندی پێنجەم: لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم سەڵەواتیان لەسەر دەدرێ.**

{عن أبي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُمْ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ}[2]، واتە: (أبو حُمَيْد) دەڵێت: وتیان ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن سەڵاواتت لێ بدەین؟

ئەویش فەرمووی: بڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

---

١) بڕوانە: عون المعبود: (١٤٢/٢٥).

٢) رواه البخاري: (٣٣٦٩)، ومسلم: (٩٣٨).

# چەند ژنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم

ناحەزان‌و دوژمنانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەردەوامن لە ڕەخنەگرتن و تۆمەتبارکردنی ئەم ئایینە پیرۆزە بەشێوەیەکی ناڕەوا.

یەکێکیش لەو تۆمەتانەی کە بێ شەرمانە! دەیدەنە پاڵ پێغەمبەری ئازیز صلى الله عليه وسلم تۆمەتی چەند ژنی، کە بەپێی بیروباوەڕی پووچەڵی ئەوان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەسێکی (شهواني)و ئارەزوباز بووەو چەندین ژنی خواستووەو لە دەوری خۆی کۆیکردونەتەوە !!

لە هەموو ئەمانە سەیرتر ئەوەیە کە ئەم تۆمەتە ناڕەوایە شتێکی تازەو داهێنراوەو، هەرگیز بە بیرو خەیاڵی خودی دوژمنە نەفام و سەرسەختەکانی سەردەمی پێغەمبەریشدا صلى الله عليه وسلم نەهاتووە!!

بۆیە لێرەدا بە گرنگی دەزانم کە بە کورتی باس لە هۆکارو حیکمەتەکانی فرەژنی پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم بکەم‌و، دەستپێکی باسەکەش بە یەکێك لە فەرموودەکانی خۆی بێت صلى الله عليه وسلم کاتێك (عمر)ی کوڕی (الخطاب) سەردانی دەکات، کە دەچێتە ژوورەوە دەبینێ لەسەر ڕاخراوێك (حصیر)ێك ڕاکشاوەو شوێنی (حصیر)ەکە بە جەستەی پیرۆزییەوە دیارە بۆیە (عمر) دەڵێت: (یا نبي الله ! لو اتخذت فراشا أوثر من هذا ؟) ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆزگە ڕاخەرێکی تری لەمە باشترت بەکاربهێنایە؟

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مَا لِي وَلِلدُّنْيَا مَا أَنَا وَالدُّنْيَا إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ الدُّنْيَا كَرَاكِبٍ ظِلَّ تحتَ شَجَرةٍ ثمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا)[1].

من چیمە بەدونیاوە نموونەی من و دونیا تەنها وەك سوارێك وایە لە ژێر سێبەری درەختێکدا بمێنێتەوەو پاشان بڕواتو بەجێی بێڵێت.

لای هەموانیش ئاشکرایە کەپێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنێو کۆمەڵگایەکی نەفامدا ژیاوە، کۆمەڵگایەك بەدڕەوشتی تێیدا ئاسایی بووەو تەنانەت ئەو ماڵانەی لەشفرۆشی تێدا ئەنجامدراوە ئاڵا بەسەر سەربانەکانیانەوە هەڵواسرابوو!

بەڵام ئەم پێغەمبەرە ڕەوشت بەرزە صلی الله علیه وسلم بە شایەتی دۆستو دوژمنی کەسێکی بەشەرم و دەست و داوێنپاك و ڕاستگۆ بووە ...

کاتێك دەگاتە تەمەنی (٢٥)ساڵی لەبری ئەوەی کچێك بخوازێت بێوەژنێك (خدیجة خوای لێ ڕازی بێت) دەخوازێت کە (١٥) ساڵ لەخۆی گەورەترەو خاوەنی چەند کوڕو کچێکە گەورەکەیان تەمەنی نزیکەی (٢٠) ساڵە !!

ئەم خوازبێنییەش لەسەر داوای (خدیجة) خۆی دەبێت کاتێك ڕاستگۆییو دەستپاکی (محمد) صلی الله علیه وسلم سەرسامی دەکات!

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەمەنی پیرۆزی گەنجێتی خۆی لەگەڵ دایکە (خدیجة)دا بەسەردەباتو تا کۆچی دوایی دەکات ژنی بەسەردا ناهێنێت، بە واتایەکی تر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تاوەکو کۆتایی تەمەنی (٥٠) ساڵی جگە لە (خدیجة) ژنی تری نەبووەو، خوازبێنی ژنی تری نەکردووە!!

---

١) رواه ابن ماجة والترمذي وأحمد، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة برقم (٤٣٨)، وأحمد في مسنده وصححه الأرناؤوط برقم: (٣٧٠٩).

**خێزانی یەکەم پاش (خدیجة):**

پاش کۆچکردنی (خدیجة) پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئافرەتێکی باوەڕداری بێوەژنی بەساڵاچوو دەخوازێت کە (سودة)ی کچی (زمعة)یە، ئەم ئافرەتە پاش گەڕانەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لە(حبشة)ەوە بۆ (مکة) هاوسەرەکەی کۆچی دوایی دەکات، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەیخوازێت بۆ ئەوەی لەلایەك دڵنەوایی بکات‌و لەلایەکی تر منداڵەکانی خۆیشی بێ سەرپەرشتیار نەمێننەوە، لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی (سودة) پارێزراوبێت نەبادا باوك‌و برا بێباوەڕەکەی بەزۆرە ملێ لە ئیسلامەتی هەڵیگەڕێننەوە.

**خێزانی دووەم پاش (خدیجة):**

پاش چەند ساڵێك لە (مدینة) (عائشة)ی کچی (أبوبکر) دەبێتە هاوسەری دووەمی، ئەم هاوسەرگیریەش لەلایەك ڕێزگرتنێکی گەورەیە لە خۆشەویسترین هاوڕێی کە (أبوبکر)ە خوای لێ ڕازی بێت‌و داننانە بەخەبات‌و تێکۆشانی خۆی‌و بنەماڵە سەربەرزەکەیدا کە پشتگیریی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و بانگەوازەکەیان کردووە، لەلایەکی تریشەوە جێبەجێکردنی خەوەکەیەتی کەسێ شەو بەسەریەکەوە لە خەویدا فریشتەیەك (عائشة)ی بۆ دێنێ کە دواتر باسی لێوە دەکەین.

**خێزانی سێیەم پاش (خدیجة):**

(حفصة)ی کچی (عمر)ە خوایان لێ ڕازی بێت، کە لە جەنگی (أحد)دا هاوسەرەکەی شەهید دەبێت، ئەم خوازبێنیەش لەلایەك ڕێزگرتنە لە هاوڕێی دووەمی کە (عمر)ی کوری (الخطاب)ەو، ڕزگارکردنیەتی لە خەم‌و خەفەت خواردن بۆ کچە گەنجە بێوەژنەکەی، لەلایەکی تریش ڕێزگرتن بوو لە شەهیدێکی بانگەوازی ئیسلام واتە: مێردەکەی.

خێزانی چوارەم:

(زینب)ی کچی (خزیمة)یە ئافرەتێکی خواناسو بەخشندەبووە لە نەفامیدا بە دایکی هەژاران ناسراوە، ئەمیش لە جەنگی (أحد)دا هاوسەرەکەی شەهید دەبێت، پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم وەك ڕێزلێگرتنێك لە خۆیو هاوسەرە گیانبەخشەکەی دەیخوازێت.

خێزانی پێنجەم:

بۆ هێورکرنەوەی (أبوسفیان)و عەشیرەتەکەی لەلایەكو، ڕزگارکردنی (أم حبیبة)ش لە بێوەژنیو غەریبایەتی ولاتی (حبشة) پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم دەیخوازێو دواتر (نجاشي) پاشای ئەو ولاتە بەڕێزەوە بەڕێی دەکات بۆ (مدینة).

خێزانی شەشەم:

پێنجەمین خێزانی پاش (خدیجة) (أم سلمة)یە، ئافرەتێکی ژیرو خوێندەوار بوو لە جەنگی (أحُد)دا هاوسەرەکەی- کە پورزاو برای شیریی پێغەمبەرە صلى الله علیه وسلم - بریندار دەبێتو دواتر کۆچی دوایی دەکات، پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم وەك دڵدانەوەیەك بۆ (أم سلمة)و ڕێزگرتنیش لە مێردە شەهیدەکەی دەیخوازێتو سەرپەرشتی کچە بچووکەکەشی (زینب) دەکات.

خێزانی حەوتەم:

(زینب)ی کچی (جحش)ە، ئەم خوازبێنیەش بە فەرمانی پەروەردگار بوو، گەورەترین حیکمەتی تێدابوو، ئەویش هەڵوەشاندنەوەو بەتاڵکردنەوەی یاسای بە کوڕکردن (التبنی) کە دواتر باسی لێدەکەین.

خێزانی هەشتەم:

(جویریة)ی کچی (الحارث) بوو سەبارەت بەم ژنهێنانە (عائشة) دەڵێ: بەهۆی ئەم خوازبێنیەوە سەد کەس لە (بني المصطلق) لە کۆیلایەتی

ئازادکران، هیچ ئافرەتێك شك نابەم ئەوەندە خێرو بەرەکەتی هەبووبێ بۆ هۆزەکەی.

خێزانی نۆیەم:

(صفیة)ی کچی (حُیَي) بوو، کە باوکی سەرۆکی (بنو النضیر) بوو لە جەنگی (بنو قریظة)دا، هاوسەرەکەشی لە غەزای (خیبر)دا دەکوژرێن‌و، (صفیة) دەبێتە کۆیلەو بەر یەکێك لە هاوەڵان دەکەوێت بەناوی (دِحیَةُ الکَلبیِ)، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەزەیی پێدا دێتەوەو لە کۆیلایەتی ڕزگاری دەکاو دەیکاتە هاوسەری خۆی.

خێزانی دەیەم:

(میمونة)ی کچی (الحارث) کە مێردی یەکەمی پێش ئیسلام تەڵاقی داوەو، مێردی دووەمیشی کۆچی دوایی کردووە.

خزمو کەسوکاری ئەم ئافرەتە بەشێوەیەکی فراوان پەلی هاویشتبوو لەنێو (بني هاشم)و (بني مخزوم)دا، بۆیە خواستنی لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم لەلایەك ڕزگارکردنی بوو لە بێوەژنی‌و بێسەرپەرشتیاری لەلایەکی تریشەوە دروستکردنی خزمایەتی‌و پتەوکردنەوەی ئەو پەیوەندیە بوو لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، ئەویش بۆ سوود لێوەرگرتنی بوو بۆ بانگهێشتکردنی کەسانێکی زیاتر بۆ ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام. خوای گەورەش زاناترە.

## خەدیجەی کچی خوەیلد خوای لێ ڕازی بێت[1]

ناوی: (خديجة)ی کچی (خويلد)ی کوڕی (أسد)ی کوری (عبد العزّى)ی کوڕی (قُصيّ)ە، لە شاری (مكة) لەدایکبووە لەناو خانەوادەیەکی بە شەرەفو دەوڵەمەندا گەورەبووەو لە سەردەمی نەفامیدا بە پاکیزە (الطاهرة) ناسراوە، باوکی لە جەنگی (الفِجَار)دا[2] دەمرێت، ناوی دایکی: (فاطمة)ی کچی (زائدة)ی کوڕی (الأصم)ی کوڕی (هرم) ی کوڕی (رواحة)یە.

(خديجة) خوای لێ ڕازی بێت لە نەفامیدا خێزانی پیاوێك دەبێت بە ناوی (أبو هالة)ی کوڕی (زرارة)ی کوڕی (النباش) کچێكو کوڕێکی لێدەبێت بە ناوی (هند)و (هالة)، پاش مردنی (أبو هالة) شوودە کات بە(عتيق)ی کوڕی (عائذ)ی کوڕی (عبدالله)، لەویش کچێکی دەبێت بەناوی هند، هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن بەپێچەوانەوە یەکەم هاوسەری (عتيق) بووەو دواتریش (أبو هالة).

(خديجة) خوای لێ ڕازی بێت ئافرەتێکی جوانو ڕەوشت بەرزو دەوڵەمەند بوو، زۆرێك لە پیاوانی (مكة) دەچوونە خوازبێنی، بەڵام بە کەسیان ڕازی نەدەبوو.

هەندێك لە پیاوانی (مكة) بازرگانییان بۆدەکرد، کاتێك هەواڵی ڕاستگۆییو دەست پاکیو ڕەوشت بەرزی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم پێدەگات دەنێرێ

---

١) الإصابة في تمييز الصحابة: (١٠٧/١٢- ١١٢)، الاستيعاب في معرفة الأصحاب: (٨٦/٢- ٨٩)، سير أعلام النبلاء: (١٠٩/٢- ١١٧)، أسد الغابة: (٨٨/٧- ٩٦)

٢) ئەم جەنگە لەنێوان قورەیشو هاوپەیمانەکانی لە خێڵی (کنانە) لەلایەكو (قیس)ی (عیلان) لەلایەکی ترەوە ڕوویدا، بۆیە ناونرا بە جەنگی (الفجار) چونکە لە مانگە حەڕامەکاندا حورمەتو، سنوورەکانی تێدا شکا. بڕوانە: (البداية والنهاية ٢/ ٢٥٤)

به شوێنیداو داوای لێدەكات بازرگانی بۆ بكاتو له بەرامبەردا قازانجێكی زیاتر لەوانی تری پێبدات، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم ڕازی دەبێتو لەگەڵ (میسره)ی (غلام)ی (خدیجة) بەرەو (شام) بەڕێدەكەون.

كاتێك دەگەنە شام پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەبن درەختێكدا له نزیك پەرستگا (صومعة)ی (نسطور)ی ڕاهیب دادەنیشێ، كاتێك (نسطور) دەیبینێ پرسیار له (مَیسرة) دەكات: ئەو پیاوەی لەبن ئەو درەختەدا دانیشتووە كێیە ؟ (مَیسره) دەڵێ: یەكێكە له قورەیشیەكانی خەڵكی (مكّة).

(نسطور): جگە لە پێغەمبەران هەرگیز كەس لەبن ئەم درەختەدا دانەنیشتووە (واتە: لەوكاتەدا)[١].

پاشان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بارەكان دەفرۆشێتو بە پارەكەی شتی تر دەكرێتو لەگەڵ (میسرة)دا دەگەڕێتەوە بۆ (مكة)، (میسرة)یش ئەوەی له پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم بینیبوو لە ڕەوشتی جوانو ڕاستگۆییو دەستپاكی بۆ (خدیجة)ی گێڕایەوە.

## خوازبێنی كردنی (خدیجة) خوای لێ ڕازی بێت

ئەوەی (خدیجة) بەشوێنیدا دەگەڕا دۆزییەوەو لەلای (نفیسة)ی هاوڕێی باسی كردو، پاشان (نفیسة) چوو بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، قسەی لەگەڵدا كرد كە (خدیجة) بخوازێت، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم ڕازی بوو، وە لەگەڵ مامەكانیدا باسی كردو ئەوانیش ڕۆشتن بۆلای مامی (خدیجة)و خوازبێنییان بۆكردو بیست وشتریان كرد بە مارەیی، ئەم خوازبێنیەش پازدە ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی بوو، (خدیجة) تەمەنی چل ساڵ بوو پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم لاوێكی تەمەن بیستو پێنج ساڵ بوو.

---

١) بڕوانە: البداية والنهاية لابن كثير: (٢/٢٥٨).

(خدیجة) یەکەم ئافرەت بوو کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خوازبێنی کردبێت‌و ژنی بەسەردا نەهێنا تا کۆچی دوایی کرد، جگە لە (إبراهیم) هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە (خدیجة)ن: یەکەم منداڵ قاسم بوو هەر بە منداڵی دەمرێ پاشان چوار کچەکەی: (زینب)و (رقیة)و (أم كلثوم)و (فاطمة)و پاشان (عبدالله) کە دوای پێغەمبەرایەتی لەدایك دەبێت‌و ئەویش هەر بەمنداڵی دەمرێ‌و نازناوی (الطاهر والطیب) بووە.

تێبینی: لە سەرچاوەکاندا سەبارەت بەتەمەنی دایکە (خدیجة) خوای لێ ڕازی بێت لەکاتی شووکردنی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چەند ریوایەتێك هەیە لەوانە: چل ساڵ‌و سی‌و پێنج ساڵ‌و بیست‌و هەشت‌و هەروەها بیست‌و پێنج ساڵیش هاتووە، بەڵام (سند)ی هیچ کام لەم ریوایەتانە ڕاست (صحیح) نین هەرچەندە ریوایەتی چل ساڵەکە بەناوبانگەو لە زۆر لە سەرچاوەکاندا باسی لێوەکراوە!

بەڵام ئەوەی کە گومانی تێدا نیە ئەوەیە کە دایکە (خدیجة) خوای لێ ڕازی بێت تەمەنی لە تەمەنی پیرۆزی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زیاتر بووە بە بەڵگەی وتەی (عائشة) خوای لێ ڕازی بێت کە (البخاری)و (مسلم) دەیگێڕنەو کاتێك دەڵێت بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (وما تذكر من عجوز من عجائز قريش)[1].

---

١) دواتر واتاو (تخریج)ی دەکەین.

## پلـەو پایەو تـایبەتمەنـدییەكـانی

(خدیجة) خوای لـێ ڕازی بێت یارمەتیـدەرێکی بـێ وێنـە بـوو بـۆ پێغەمبـەر صلی الله علیـه وسـلم (عائـشة) دەفـەرموێت: كاتێك پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسلم لە ئەشكەوتی (حراء) نیگـا (وحي) بۆهات گەڕایەوە ماڵەوە دڵی دەلەرزی، تا هاتەوە بۆلای خدیجةو فەرمووی: (زَمِّلُوني زَمِّلُوني) واتە: دامپۆشن دامپۆشن، دایانپۆشـی تـاوەكو ترسـەكەی نیـشتەوە، ڕووداوەكـەی بـۆ خدیجـە گێڕایـەوەو، فـەرمووی: (لقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي)، واتـە: بەڕاسـتی لـە گیـانی خـۆم تـرسام، (خدیجة)ش خوای لێ ڕازی بێت فەرمووی: (كَلَّا وَاللَّهِ مَـا يُخْزِيـكَ اللَّـهُ أَبَـدًا إِنَّـكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ وَتَحْمِلُ الْكَلَّ وَتَكْسِبُ الْمَعْـدُومَ وَتَقْـرِي الـضَّيْفَ وَتُعِينُ عَلَـى نَوَائِـبِ الْحَقِّ)[١]، واتە: نـەخێر، سـوێند بـەخوا هـەرگیز خـودا شـتی وا ناكـاو تـۆ ڕیـسوا ناكا، تۆ پەیوەندی خزمایـەتی بەجێـدەهێنیتو بـاری ئـازاری خـەڵك دەخەیتـە سەرشـانی خـۆتو هـەژار تێردەكـەیتو ڕێـز لـە میـوان دەگریـتو یارمـەتی لێقـەوماوان دەدەیت. پاشـان (خدیجة) لەگەڵ خۆیدا بردیە دەرەوە تا گەیشـتە ماڵی (ورقة)ی كوڕی (نوفل)ی كوڕی (أسد)ی كوڕی (عبدالعزی)ی ئامۆزای خۆی.

١- یەكـەم كـەس بـوو كـە موسـڵمان بـوو: (إیـاس) دەڵـێ: بـاوكم (عفیـف) بـۆی گێڕامەوە، وتی: من پیاوێكی بازرگان بووم لە ڕۆژێك لـە ڕۆژەكـانی (حـج)دا ڕۆشتم بۆ(منی) بۆلای (عباس)ی كوڕی (عبـدالمطلب) شـتی لێبكـڕم، كاتێـك كە پێكەوە بووین پیاوێـك هـات ڕووی لـە (كعبـة) كـردوو دەسـتی كـرد بـە نوێـژكردن، پاشـان ئافرەتێـكو پاشـانیش كوڕێـك بەهـەمان شـێوە هـاتنو دەستیان كرد بەنوێژ كردن، منیش وتم ئەی (عباس) ئەمە چۆن ئاینێكە؟ بەڕاستی من نازانم ئەمە چیە !

١) رواه البخاري: (٣)، ومسلم: (٢٣١)

(عباس) وتی: ئەوە (محمد)ی کوڕی (عبدالله)یە دەڵێ من نێرراوی خوام گەنجینەکانی (کسری)و (قیصر)م بۆ (فتح) دەکات، ئەو ژنەش (خدیجة)ی کچی (خویلد)ەو ئەو کوڕەش ئامۆزایەتی (علي) کوڕی (أبو طالب)ە باوەڕیان پێهێناوە، (عفیف) وتی: خۆزگە منیش ئەو ڕۆژە باوەڕم بهێنایە دەبوومە چوارەم کەس[1]، (إبن الأثیر) دەڵێ: بە کۆی دەنگ (إجماع)ی موسڵمانان (خدیجة) یەکەم کەس بوو کە موسڵمان بو، هیچ پیاو ژنێك لە موسڵمانبووندا پێشی نەکەوتوون[2].

٢- خوای گەورە سەلامی لە (خدیجە) کردووە: عن أبي هريرة ﷺ، قال: أتى جبريل النبي صلى الله عليه وسلم، فقال: يا رسول الله هذه خديجة قد أتت معها إناء فيه إدام، أو طعام أو شراب، فإذا هي أتتك فاقرأ عليها السلام من ربها ومني، وبشرها ببيتٍ في الجنة من قصب لا صخب فيه، ولا نصب[3]، واتە: (أبو هريرة) دەفەرموێ: جبريل هاتە لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، فەرمووی (خديجة) خەریکە دێت بۆلات دەفرێکی پێیە، پێخور، یان خواردن یان خواردنەوەی تێدایە، هەرکات گەیشتە لات سەلامی پێبگەیەنە لە پەروەردگاریەوەو، لەلایەن منیشەوە، مژدەی خانوویەك پێبدە لە بەهەشتدا لە قامیشی مرواری دروستکراوە، نەدەنگە دەنگی تێدایە، نەماندوبوون.

هەندێ لە زانایان دەڵێن: خانووەکەی دەنگە دەنگو ماندوبوونی تێدانیە چونکە (خدیجة) هەرگیز دەنگی بەسەر پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بەرزنەکردۆتەوەو ماندووی نەکردوەو ئازاری نەداوە.

---

١) البداية والنهاية لابن كثير، ( ٣/ ٣٥)، صحيح السيرة النبوية للألباني، (ل ١١٥، ١١٦).
٢) أسد الغابة: (٨٩/٧).
٣) رواه البخاري، ٣٥٣٦، و مسلم:٤٤٦٠.

٣- پلەو پایەی لە دڵی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم : عن عائشة رضي الله عنها، قالت: ما غرت على أحد من نساء النبي صلى الله عليه وسلم، ما غرت على خديجة، وما رأيتها، ولكن كان النبي صلى الله عليه وسلم يكثر ذكرها، وربما ذبح الشاة ثم يقطعها أعضاء، ثم يبعثها في صدائق خديجة، فربما قلت له: كأنه لم يكن في الدنيا امرأة إلا خديجة، فيقول: إنها كانت، وكانت، وكان لي منها ولد[1]، واتە: (عائشة) دەفەرموێ: من غیرەت نەیگرتووم بەرامبەر بە هیچ کام لە خێزانەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جگە لە (خديجة) هەرچەند نەیشم بینیبوو، بەڵام پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زۆرباسی دەکرد، بگرە زۆرجار کە مەڕێکی سەردەبڕی پارچەپارچەی دەکردو پاشان دەینارد بۆ هاوڕێکانی (خديجة)، منیش زۆر جار پێم دەوت: ئەوە چیە ئەوەندە دەڵێی (خديجة، خديجة) ! دەڵێی ئەم جیهانە کەسی تری تێدا نییە ئەو نەبێ ! ئەویش دەیفەرموو: بەڕاستی ئەو وەهاو وەها بوو، لەویش مناڵم هەبوو.

٤- هەمیشە لەیادی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بووە: عن عائشة، قالت: استأذنت هالة بنت خويلد أخت خديجة على رسول الله صلى الله عليه وسلم، فعرف استئذان خديجة فارتاع لذلك فقال: اللهم هالة، فغرت فقلت: وما تذكر من عجوز من عجائز قريش، حمراء الشدقين، هلكت في الدهر فأبدلك الله خيرا منها[2]، وفي روايةٍ :(ما أبدلني الله عز وجل خيرا منها، قد آمنت بي إذ كفر بي الناس، وصدقتني إذ كذبني الناس، وَ واستني بمالها إذ حرمني الناس، ورزقني الله عز وجل ولدها إذ حرمني أولاد

---

١) رواه البخاري: ٣٥٣٤.

٢) رواه البخاري: ٣٥٣٦ ومسلم ٤٤٦٧ .

النسـاء)[١]، واته: (عائشة) دەڵێ: (هالة) کچی (خویلد)ی خوشکی (خدیجة) داوای مۆڵەتی کرد بۆئەوەی بچێتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پێغەمبـەریش صـلی الله علیـه وسـلم بـەدەنگی ئـەودا دەنگـی (خدیجـة)ی بیرکەوتـەوە (دەنگیـان لەیـەك دەچـوو)، ڕاچەنیو فەرمووی:خوایـە (هالـة) بێت ! منیش غیرەت گرتمیو وتم: یادی چی دەکەیتـەوە لـە پیرەژنێـك لـە پیرەژنـەکانی قـریش، شـەویلە سووری پـووك بـەدەرەوە بـووی دان لـە دەمـا نەماو، کەچەندین ساڵە مردووە، خوای گەورە باشتر لەوی پـێ بەخـشیویت. پێغەمبــەریش صــلی الله علیــه وســلم فــەرمووی بــەخوا، لــەو باشــتری پێنەبەخشیوم، بەڕاستی کاتێك کە خەڵك باوەڕیان پێنەدەکردم ئەو باوەڕی پێهێنام، کاتێك کە خەڵك بەدرۆیان دەخـستمەوە ئـەو متمانـەی پێـدەکردم، کاتێك خەڵك لە یارمەتی خۆیـان بێبەشـیان کـردم، ئـەو کردمیـە هاوبەشـی سامانەکەی خۆی، خـوای گـەورە لـە ئـەو، منـاڵی پێبەخـشیم، لـە ژنـانی تـر بێبەشی کردم.

٥- ڕێزگرتنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم له هاوڕێکانی: عـن عائـشة، قالـت: جاءت عجوز إلـى النبي صلى الله عليه وسلم وهو عندي، فقال: لهـا رسـول الله صلى الله عليه وسلم: من أنت؟،قالت: أنا جَثَّامَةُ المُزَنِيَّةُ، فقال صلى الله عليه وسلم: بل أنت حَسَّانَةُ المُزَنِيَّةُ، كيف أنتم ؟ كيف حالكم ؟ كيف كنـتم بعـدنا ؟، قالت: بخيـر بأبي أنت وأمي يا رسول الله صلى الله عليه وسلم، فلمـا خرجـت قلت: يا رسول الله صلى الله عليه وسلم، تقبل على هذه العجوز هذا الإقبـال ؟ فقال صلى الله عليه وسلم: إنها كـانت تأتينــا زمـن خديجة وإنّ حـسن العهـد

١) رواه أحمد: (٢٣٧١٩) وقال ابن كثير في السيرة النبوية: (١٣٦/٢): تفـرّد بـه أحمـد وإسـناده لا بأس به، وحسّنه الأرناؤوط برقم: ٢٤٩٠٨.

من الإيمان»[1]، واتە (عائشة) دەڵێ: پێغەمبەر لەلای من بوو پیرەژنێك هات بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: تۆکێیت ؟ وتی: من (جثامة المزنية )م. فەرمووی: نەخێر تۆ (حسّانة المزنية)ی، ئێوە چۆنن؟ حاڵتان چۆنە؟ پاش ئێمە چۆن بوون ؟ وتی: باشین، باوكو دایکم بەقوربانت بێت، ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێك ڕۆیشتە دەرەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو شێوازە پێشوازیت لەو پیرەژنە کرد !؟ فەرمووی: ئەو لە سەردەمی (خديجة)دا دەهات بۆ لامان، بە ڕاستی وەفای چاك بەشێکە لە باوەڕ.

٦- <u>له باشترین ژنانی بەهەشتە:</u> عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم أَفْضَلُ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ وَفَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ وَ مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ وَآسِيَةُ بِنْتُ مُزَاحِمٍ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ[2]، واتە: (إبن عباس) دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: باشترین ژنانی ناو بەهەشت: (خديجة)ی کچی (خويلد)و (فاطمة)ی کچی (محمد)و (مريم)ی کچی (عمران)و (آسية)ی کچی (مزاحم)ی ژنی (فرعون)ە.

٧- <u>پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە بینینی ملوانکەکەی، دڵی بەرامبەر بە بێباوەڕێك نەرم دەبێت:</u> (عائشة) دەڵێ: کاتێ خەڵکی (مكة) ڕزگارانە (فدية)یان دەنارد بۆ بەردانی دیلەکانیان لەجەنگی بەدردا، (زينب) ی کچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆئازادکردنی (أبوالعاص)ی مێردی هەندێك پارەو ملوانکەیەکی خۆی – کە لە (خديجة)ی دایکیەوە بۆی مابوویەوە - نارد، کاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ملوانکەکەی بینی زۆر

---

١) أخرجه الحاكم والبيهقي وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة برقم: ٢١٦ .

٢) رواه أحمد: (٢٩٠٣) وصححه شعيب الأرنؤوط، والألباني في السلسلة الصحيحة برقم: ١٥٠٨ .

بەزەیی بە كچەكەیدا دێتەوە سەردەمی دایكە (خدیجة)شی وەبیر دێتەوە، بۆیە بە هاوەڵەكانی دەفەرموێت: ئەگەر پێتان باشە دیلەكەی بۆ بەردەن‌و ملوانكەكەشی بۆ بگەڕێننەوە، ئەوانیش وتیان: بەڵێ. پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم بەڵێنی لێ وەردەگرێ كە ڕێگە بدات (زینب)ی كچی كۆچ بكات بۆ (مدینة)و، (زید)ی كوڕی (حارثة) وپیاوێكی پشتیوان (أنصاري) دەنێرێت بە شوێنیداو دەفەرموێت: (كونا ببطن یأجج حتی تمرَ بكما زینب فتصحباها حتی تأتیا بها)[1]، واتە: لە (بطن یأجج) بمێننەوە تا (زینب) دەگاتە لاتان‌و پاشان لەگەڵ خۆتاندا بیهێنن.

٨- لە ژنە كاملەكانە : عن قرة بن إیاس ﷺ قال: قال رسول الله صلی الله علیه وسلم: كمل من الرجال كثیر ولم یكمل من النساء إلا ثلاث، مریم بنت عمران، وآسیة امرأة فرعون، وخدیجة بنت خویلد، و فضل عائشة علی النساء كفضل الثرید علی سائر الطعام[2]، واتە: (قرة)ی كوڕی (إیاس) دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: لەناو پیاواندا زۆریان ( كامل) پیاوی تەواویان لێ دەرچوو، بەڵام لەناو ژناندا (كامل) تەواویان تیانەبووە جگە لە سیان: (مریم)ی كچی (عمران) و (آسیة)ی ژنی (فرعون)و (خدیجة)ی كچی (خویلد). بەڕاستی ڕێزی (عائشة) بەسەر ئافرەتانی تردا، وەك ڕێزی تێكوشین بە گۆشت وایە بە سەر خواردنەكانی تردا.

زانایان دەڵێن: خاڵی هاوبەشی ئەم سێ ژنە سەلامی خوایان لێبێت ئەوەیە كە هەر یەكێكیان پشتگیری لە پێغەمبەرێك كردووە، باوەڕی پێهێناوەو بەباشترین شێوە خزمەتی كردووە .

---

١) رواه أبو داود وحسنه الألباني، بڕوانە: صحیح وضعیف سنن أبي داود (٢٦٩٢).

٢) قال (ابن كثیر): رواه ابن مردویه في تفسیره وإسناده صحیح، بڕوانە: البدایة والنهایة (٣/١٥٩- ١٦٠).

آسیة (موسى)ى پەروەردە کردو چاکەی لەگەڵ کردو باوەڕیشی پێهێنا، (مریم)یش (عیسى)ى بەخێو کردو کاتێکیش بوویە پێغەمبەر باوەڕی پێهێنا، (خدیجة)ش هانی پێغەمبەری صلى الله علیه وسلم دا بۆخوازبێنی کردنی و باوەڕی پێهێناو پشتگیری لێکرد.

٩- پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم ژنی بەسەردا نەهێنا : (عائشة) خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: لَمْ يَتَزَوَّجِ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم عَلَى خَدِيجَةَ حَتَّى مَاتَتْ [1]، واتە: پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم ژنی نەهێنا بەسەر (خَدِيجَة)دا تاوەکو کۆچی دوایی کرد. بۆ ماوەی ٢٥ساڵ بەتەنها لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله علیه وسلم ژیاوە.

## کۆچی دوایی دایکە (خدیجة) خوای لێ ڕازی بێت

سێ ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم بۆ (مدینة) واتە لەساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیداو، لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا (خدیجة) کۆچی دوایی دەکات (ئەگەر لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا شووی بە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم کردبێ) و لەگۆڕستانی (الحجون)[2] دەنێژرێت، پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم خۆی چووە ناو گۆڕەکەی و دایهێڵایە ناویەوە، هێشتا نوێژی مردوو (دانەنرابوو) نەکرابوو ، هەندێك لەنوسەرانی ژیاننامەی (سیرة) دەڵێن: بەهۆی بەدوای یەکدا هاتنی ئێش و ئازارەکان لەو ساڵەدا (واتە: کۆچی دوایی (أبوطالب)ی مامی و پاش چەند مانگێکیش (خدیجة)ی هاوسەری)، پێغەمبەر

---

١) رواه مسلم: (٤٤٦٦) .

٢) گۆڕستانی خەڵکی (مکة)یە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتیەوە تەنیشت کێوی (الحجون)، لە سەردەمی نەفامیەوە تا ئەمڕۆ مردووی تێدا دەنێژن، هەروەها گۆڕستانی (المعلاة)یشی پێ دەوترێت.

صلى الله عليه وسلم ئەو ساڵەی ناونا ساڵی ماتەمینی (عام الحزن)[1]، بەڵام ئەلبانی دەڵێت: تەنها سەرچاوەیەك، كە بینیبێتم ئەم ریوایەتەی هێنابێت (القسطلاني)یە لە كتێبی (المواهب اللدنية ) كە دەڵێت (صاعد) وتوویەتی، ئەم (صاعد)ەش (الزرقانی)و (إبن حجر العسقلاني) بەلاوازی دادەنێن، كەواتە ئەم ریوایەتە لاواز (ضعیف)ە[2].



گۆڕستانی (المعلاة)

١) بۆ نموونە بڕوانە: الرحيق المختوم للمباركفوري، ل ١٠٤، فقه السيرة للبوطي، ل ١٣٠.
٢) بڕوانە: دفاع عن الحديث النبوي والسيرة للألباني: ل ١٨ .


بيت السيدة خديجة رضى الله عنها
alajeeb.com


رسم توضيحي لبيت السيدة خديجة رضى الله عنها
مكان تجارة السّيدة خديجة رضي الله عنها
alajeeb.com
مكان استقبال الوفود
مصلى النبي
غرفة النبي
٣,٠
باب
٧,٥
مولد فاطمة

## سەوودەی کچی زەمعە خوای لێ ڕازی بێت[١]

ناوی: (سـودة)ی کـچی (زمعـة)ی کـوڕی (قـیس)ی کـوڕی (عبـد شمـس)ە. دایکیشی ناوی (الشموس)ی کچی (قیس)ی کوڕی(زید)ە.

(سودة) خێزانی ئامۆزایەکی خۆی بو بـە نـاوی (الـسکران)ی کـوڕی (عمـرو). خۆیو مێردەکەی موسڵمان بونو پاشان کۆچیان کرد بۆ وڵاتی (حبشة) (کۆچی دووەم)، پاشان گەڕانەوە بۆ (مكة)، لە دەیەمین ساڵی پێغەمبەرایەتیدا لە (مكة) (الـسکران)ی مێـردی کۆچـی دوایـی کـرد، هەنـدێکیش دەڵێن هـەر لـە (حبـشة) کۆچی دوایی کردووە، لە چەند سەرچاوەیەکیشدا وتراوە ئەم پیاوە لە (حبشە) لـە ئـایینی ئیـسلام هەڵگەڕاوەتـەوەو بـووە بـە گـاور، بـەڵام نـەك ریوایـەتێکی (صحیح) بەڵکو هیچ ریوایەتێکی (ضعیف)یش لەوبارەیەوە نەهاتووە[٢].

### خوازبێنـی کردنی (سـودة خدیجة) خوای لـێ ڕازی بێت

(أبو سلمة)و (یحیی) دەگێڕنەوە دەڵێن: دوای کۆچکردنی (خدیجة) (خولة)ی کـچی (حکیم)، ژنی (عثمان)ی کوڕی (مظعون) هات بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا تَزَوَّجُ ؟ (ئـەی پێغەمبـەری خـوا ژن نـاهێنی)؟ فەرمووی: مَنْ ؟ (کـێ)؟

وتـی: إِنْ شِئْتَ بِكْرًا وَإِنْ شِـئْتَ ثَيِّبًـا.

ئەگەر کچت دەوێ هەیەو بێوەژنیشت دەوێ هەیە.

---

١) الإصابة: (٤٥١/١ )، (١٢/٤- ١٣)، الاستيعاب: (٢١٦/١٢- ٢١٧)، سيـر أعلام النبلاء: (٢٦٥/٢- ٢٦٩).

٢) بڕوانە: ما شاع ولم يثبت في السيـرة النبوية ل ٤٤- ٤٥.

فەرمووی: فَمَنْ البِكْرُ ؟ کچەکـە کـێیە ؟

وتی: ابنَةُ أحَبُ خَلقِ اللهِ عزّ وَجَلّ إلَيكَ عَائِشَةُ بِنتُ أبي بَكْرٍ.

کچی خۆشەویستـرین دروستکراوی خوای گەورە بەلاتـەوە، (عائـشـة)ی کـچی (أبوبکر).

فەرمووی: وَمَنْ الثَيِبُ ؟ (ئەی بێوەژن کـێیە ؟)

وتی: سَوْدَةُ ابنَةُ زَمعَـةَ قَدْ آمَنَت بِكَ وَاتبَعَتكَ عَلى مَا تقُولُ.

(سـودة)ی کـچی (زمعـة)، بەڕاسـتی بـاوەڕی پێهــێنایتو شـوێنت کـەوتووە لەسەر ئەوەی، کە دەیڵێیت.

فەرمووی: فَاذهَبي فَاذكُرِيهِمَـا عَلَيّ. (بڕۆ هەردووکیانم بۆ داوا بکە) .

(خولـة) ڕۆیشـت بۆ مـاڵی (أبـوبکر)، وتـی: يَـا أمَّ رُومَـانَ مَـاذَا أدخَلَ اللهُ عَزّ وَجَلّ عَلَيكُـمْ مِنَ الخَيرِ وَالبَرَكَةِ ( ئەی دایکی رومان خوا چ خێرو بەرەکەتێکی ڕشـتووە بەسەرتانا) !

وتی: وَمَا ذَاكَ ؟ ( ئەو بەرەکەتە چییە) ؟

وتی: أرسَلَنِي رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم أخطُبُ عَلَيهِ عَائِشَـةَ .

{پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناردوومی خوازبێنی (عائشة)ی بۆ بکەم} .

وتی: چاوەڕوانی (أبوبکر) بە تـا دەگەڕێتـەوە، کـە گەڕایـەوە بەهـەمان شـێوە بەویشی وت:

(أبوبکر)یش گوتی: وَهَـل تَصلُحُ لَهُ إنّمَا هِيَ ابنَةُ أخِيـهِ ؟

(ئایا حـەڵاڵە بۆی، خۆ کـچی براکەیەتی ؟!)

(خولة) گەڕایەوە بـۆ لای پێغەمبـەر صلى الله عليـە وسـلم و بـۆی گێڕایـەوە، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ارجِعي إلَيهِ فَقُولي لَـهُ أنَـا أخُـوكَ

وأنتَ أخِي فِي الإِسـلامِ وَابنَتكَ تَصلحُ لِـي. (پێی بڵـێ مـن بـرای ئـەوم، وە ئەویش برای منە لە ئیسـلامدا، کچەکەیم بۆ حـەڵاڵە).

پاشـان (خولـة) گەڕایـەوە بـۆلای (أبـوبكر)و پێـی وت. أبـوبکریش وتـی: چاوەڕوان بە. پاشـان ڕۆیشـتە دەرەوە.

(أم رومـان) وتـی: بەڕاسـتی (مطعـم)ی كـوڕی (عَـديّ) داوای كـردووە بـۆ کوڕەکەی، سوێند بەخوا (أبوبكر) هیچ بەڵێنێکی نەداوە جێبەجێی نەکردبێت.

(ابـوبكر) ڕۆیـشت بـۆ مـاڵی (مطـعم)ی كـوڕی (عَـدِيّ)، ژنەکەشـی - دایکـی کوڕەکە - لـەوێ بوو، وتی بە أبوبكر:

يَا ابنَ أبي قُحَـافَةَ لعَلَّكَ مُصْـبٍ صَاحِبَنَا مُدخِلهُ فِي دِينِكَ الذِي أنتَ عَلَيـهِ إن تَزَوَّجَ إلَيـكَ. (ئەی كوڕی (أبي قحافة) لەوانەیـە ئەگـەر کوڕەکـەمان کچەکەتان بخوازێـت لـە دینەکـەی خـۆی لایـدەیتو بیخەیتـە سـەر ئـەو دینـەی کـە خـۆتی لەسـەرە!)، (أبـوبكر)یـش وتـی بـە (مُطعِـم): آقَـولَ هَـذِهِ تقُولُ ؟ (تـۆش هـەمان قسەی ژنەکەت دەکەیت) ؟

ئەویش وتی: إنَّهَـا تقُولُ ذَلِكَ ! (بەڕاستی ئەو وا دەڵـێ !) .

(أبـوبكر)یـش ڕۆیـشتە دەرەوەو، خـوای گـەورە ئـەوەی لـە دەروونیـدا بـوو سەبارەت بەو بەڵێنەی، کە دابووی لای بردو، گەڕایـەوە ماڵـەوەو، بـە (خولـة)ی وت: ادْعِي لِي رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم (پێغەمبەری خوام صـلى الله عليـه وسلم بۆ بانگ بکـە)، بانگی کردو، لـێی مارەکرد، (عائـشة) لەوکاتـەدا تەمـەنی شەش یـان نۆ سـاڵ بوو.

پاشـان (خولـة) ڕۆشـت بـۆ لای (سـودة)ی کـچی (زمعـة)، وتـی: خـوا چ خێـرو بەرەکەتێکی ڕشتووە بەسەرتا !

وتی: چییــە ؟

وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناردوومی خوازبێنی تۆی بۆ بکـەم .

وتی: وَدِدتُ، ادخلِـي إِلَى أبي فاذكُـرِي ذَاكَ لَهُ.

(حەز دەکەم، بڕۆ بە باوکم بڵـێ).

باوکی پیـرە پیاوێك بـوو، لـە حـەجیش دواکـەوتبوو، (خولـة) چـوو بـۆ لایو سەلامی لێکرد بە سەلامی جاهلیەت، ئەویـش وتی: ئەوە کێیە ؟

وتی: (خولة)ی کچی (حکیـم)ە.

وتی: بۆچی هـاتووی ؟

وتی: أرسَـلَني مُحَمَّدُ بنُ عَبْدِ اللهِ أخطُبُ عَلَيـهِ سَوْدَةَ.

(محمد)ی کوڕی (عبدالله) ناردوومی (سودة)ی بۆ بخوازم.

وتی: (خولة)م بۆ بانگ کە. منیش بانگم کرد.

وتـی: کـچۆڵەکەم ،(خولـة) دەڵێـت (محمـد)ی کـوڕی (عبداللـە)ی کـوڕی (عبدالمطلـب) نـاردوومی بـۆ خوازبێنیـت، بەڕاسـتی هاوتایـەکی بـەڕێزە، حەزدەکەیت مارەتکـەم لـێی ؟

وتی: بەڵێ.

وتی: بڕۆ بانگی کـە بۆم.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هـاتو ئەویش لـێی مارەکرد ... [1].

براکەی (سودة)، (عبد)ی کوڕی (زمعة) هـات بـۆلای (سـودة)، خـۆڵی دەکـرد بە سەری خۆیدا، (لەبەر شووکردنی بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم) ! بەڵام لەدوای موسڵمان بوونی دەیوت: بە ڕاستی من گێل بووم کە خـۆڵم دەکـرد بەسەری خۆمدا کاتێك پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليـه وسـلم (سـودة)ی کـچی (زمعة)ی مارە کـرد.

---

١) رواه احمد والطبـراني وقال الحافظ ابـن حجـر فـي فـتح البـاري (٢٢٥/٧): إسـناده حـسن، وحسّنه شـعيب الأرنــاؤوط في مسند أحمد برقم: (٢٥٨١٠).

خوێنەری بەڕێز:

بەپێی ڕاستترین گێڕانەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دوای کۆچکردنی (خدیجة) بە ماوەیەکی کەم، واتە لە تەمەنی پەنجا ساڵیداو لە دەیەمین ساڵی پێغەمبەرایەتیدا (عائشة) پێش (سودة) خوایان لێ ڕازی بێت مارەدەکات، بەڵام دواتر لە (مدینة) دەیگوازێتەوەو، (سودة)ش لە تەمەنی (٥٥ — ٦٠) ساڵیدا لە هەمان ساڵدا دەگوازێتەوەو سێ ساڵ بەتەنها لەگەڵی ژیا.

**پلەو پایەو سەروەرییەکانی**

١— سوربوونی لەسەر ئەوەی کە لە دونیاو لە دوارۆژیشدا یەکێك بێت لە خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم : عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : مَا رَأَيْتُ امْرَأَةً أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ فِي مِسْلَاخِهَا مِنْ سَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ مِنْ امْرَأَةٍ فِيهَا حِدَّةٌ قَالَتْ فَلَمَّا كَبِرَتْ جَعَلَتْ يَوْمَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صلی الله علیه وسلم لِعَائِشَةَ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ صلی الله علیه وسلم قَدْ جَعَلْتُ يَوْمِي مِنْكَ لِعَائِشَةَ فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلی الله علیه وسلم يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ يَوْمَيْنِ يَوْمَهَا وَيَوْمَ سَوْدَةَ.[1] وفي روايةٍ : لعلي أكون من نسائك في الجنة[2]، واتە: (عائشة) دەڵێ: هیچ ژنێکم نەدیوە بەدڵ حەز بکەم وەکو ئەو وابم بە ئەندازەی (سودة)ی کچی (زمعة) ژنێکی ئازاو دەروون قایم بوو، کەچوو بەساڵدا سەرە شەوی خۆی بەخشی بە (عائشة)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نۆرەی خۆم ئەبەخشم بە (عائشة)، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دووشەو لەلای (عائشة) دەمایەوە، شەوەکەی خۆی و شەوەکەی (سودة)، لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: بەڵکو لە بەهەشتدا یەکێك بم لە خێزانەکانت .

١) مسلم : ٢٦٥٧.

٢) (صحيح)، مشكاة المصابيح للتبريزي بتحقيق الألباني (٢/٢٣٥).

سـەبارەت بـە هۆكـاری بەخـشینی سـەرە شـەوی خـۆی بـە عائـشة لـە ریوایەتێكی تردا عائشة دەڵێت: قالت سودة بن زمعة حين أسنت و فرقت أن يفارقها رسول الله صلى الله عليه وسلم يا رسـول الله: يـومي لعائـشـة فقبـل منها رسول الله صلى الله عليه وسلم قالت عائشة رضي الله عنها في ذاك أنـزل الله عـز وجـل فيهـا وفـي أشباهـهــا: ﴿وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا ... ﴿١٢٨﴾﴾[1] النساء، واتە: (سودة) خوای لـێ رازی بێ كاتێك دەچێت بەساڵداو، دەترسـێ پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم لێـی جیـا بێتـەوە دەڵێـت: سەرە شەوی من بۆ (عائشة)، پێغەمبەری خوایش صلى الله عليه وسلم ڕازی دەبێت، (عائشة) دەڵێت: بـۆ ئـەو حاڵەتـەو هاوشێوەكانی خـوای گـەورە ئـەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا ... ﴿١٢٨﴾﴾.

هەروەها (ابن عباس)یش دەڵێت: خشيت سودة أن يطلقـها النبي صلى الله عليه وسلم فقالت لا تطلقني وأمـسكني واجعـل يـومي لعائـشة ففعـل فنزلـت: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ﴿١٢٨﴾﴾[2] النـسـاء، واتە: (سودة) خوای لـێ ڕازی بێت دەترسا لەوەی پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليه وسلم تەڵاقی بدات، دەڵێت: تەڵاقم مەدەو لای خۆت بمهێڵـەوەو سـەرە شەویشم بدە بە (عائشة)، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم بەگوێی كردو ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە.

---

١) رواه الحاكم في مستدركه برقم: (٢٧٦٠) وصححه الذهبي، والألباني في السلسلة الصحيحة برقم: (١٤٧٩).

٢) صحيح، الإرواء (٢٠٢٠) .

بۆيـه زۆربـەی زانايـانی ڕاڤـەكاری قورئـان دەڵێن ئـەم ئايەتـه بـۆ دايكـه (سودة) دابەزيوەو، (القرطبي) و(ابن عطية)ش ئەم بۆچوونەيان بەپەسـەند زانيوه[1].

خوێنەری بەڕێز:

لەوانەيـه ئـەو پرسـيارەت لا گەلاڵـه بووبێـت كـه بۆچـی دايكـه (سـودة) ترساوه لەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەڵاقی بدات ؟!

بۆ وەڵامی ئەم پرسيارەش زانـايان چەند ڕايەكـيان هەيه:

- سـودة خوای لـێ ڕازی بێت- لەبەر پيـربون و لاوازبونی- خۆی هەستی بە كەمتەرخەمی كردووه بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم.
- كەمێك توندبووه بەرامبەر بە خێزانەكانی تـری پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم.
- پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم ويـستويەتی بيبەخـشێت لـەو ئەرك و بارقورسيەی لە ئەستۆی دابووە وەك خێزانی پێغەمبەرێك.
- لاوازبـوون لـە ئەنجامـدانی كـاری ژن و مێردايـەتی، بـەڵام يـەكێك لـە ڕاويەكانی ئەم ريوايەته (الواقدي)يه كه لەلای زانايانی (حديث) بـه لاواز (ضعيف) ناسراوە.

٢- ئافرەتێكی خواپەرست بوو: عَنْ عائِشَةَ أنَّهَا قالَت: اسـتَأذَنَت سَـودَةُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لَيْلَةَ المُزدَلِفَةِ تَـدْفَعُ قَبْلَهُ وَقَبْلَ حَطْمَةِ النَّاسِ وَكَانَت امْرَأةً ثَبِطَةً يَقُولُ القَاسِمُ وَالثَّبِطَةُ الثَّقِيلَةُ قَالَ فَأَذِنَ لَهَا فَخَرَجَت قَبْلَ

---

١) بەڵام هەندێكی تر لە زانايانی ڕاڤەكار لەوانە: (البغوي)و (الطبـرسي) پێيان وايە كە ئـەو ئايەتە بۆ كچی (محمد)ی كوڕی (مـسلمة) خێزانـی (رافـع) كـوڕی (خـديج)ی (الأنـصاري) دابەزيوه، هـەردووڵاش بەڵگەی (صـحيح)يـان بەدەسـتەوەيە، هەرچـەندە بەڵگـەكانی ڕای يەكەم (صحيح) ترن.

دَفْعِهِ وَحَبَسَتا حَتّى أصبَحْنا فدَفَعْنا بدَفْعِهِ وَلَأن أكُونَ استَأذَنْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم كَمَا استَأذَنَتهُ سَوْدَةُ فأكُونَ أدفَعُ بِإذْنِهِ أحَبُّ إلَيَّ مِنْ مَفرُوحٍ بِهِ[1]، واته: (عائشة) دەڵێ: (سودة) مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە شەوی (المزدلفة) تاپێش ئەو بڕوات، پێش ئەوەی خەڵکی قەڵەباڵغی دروستکەن، چونکە ئافرەتێکی قورس بوو، ئەویش مۆڵەتیدا، ئیتر هەتا بەیانی ئەو کەوتە ڕێ خۆ ئەگەر منیش مۆڵەتم بخواستایە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وەك (سودة) بڕۆشتایەم لە هەموو شت لەلام خۆشتربوو .

٣- هەمیشە قیامەتی لەیادبوو : عن سودة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قالت: قلت : يا رسول الله إذا متنا صلى لنا عثمان بن مظعون حتى تأتينا ؟ فقال لها رسول الله صلى الله عليه وسلم: لو تعلمين علم الموت يا بنت زمعة لعلمت أنه أشد مما تقدرين عليه[2]، واته: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ئێمە مردین تاوەکو تۆ دێیت بۆ لامان (عثمان) کوڕی (مظعون) (لەو کاتەدا مردبوو) داوای لێخۆشبوونمان بۆ دەکات.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: کچی (زمعة) ئەگەر بەتەواوی مردن بناسی ئەوسا بۆت ڕوون دەبێتەوە کە لەوە قورس ترە کە تۆ حیسابی بۆ دەکەیت.

٤- بە هۆی ئەوەوە لەلایەن پەروەردگارەوە مۆڵەت بە ژنان درا: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجَتْ سَوْدَةُ بَعْدَمَا ضُرِبَ الْحِجَابُ لِحَاجَتِهَا وَكَانَتْ امْرَأَةً جَسِيمَةً لَا تَخْفَى عَلَى مَنْ يَعْرِفُهَا فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ

١) رواه البخاري: ١٥٦٩ ومسلم: ٢٢٧١.

٢) رواه الطبراني في الكبير: (٣٤/٢٤) وقال الهيثمي في مجمع الزوائد (٥٩/٣): ورجاله رجال الصحيح.

فقَالَ يَا سَوْدَةُ أمَا وَاللَّهِ مَا تخفَينَ علَينَا فانظري كيْفَ تخرُجِينَ قالت فانكفأت رَاجِعَةً وَرَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فِي بَيْتِي وَإِنَّهُ ليَتَعَشَّى وَفِي يَدِهِ عَرْقٌ فدَخَلَتْ فقَالَت يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي خَرَجْتُ لِبَعْضِ حَاجَتِي فقَالَ لِي عُمَرُ كَذَا وَكَذَا قالت فأوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ ثمَّ رُفِعَ عَنهُ وَإِنَّ العَرْقَ فِي يَدِهِ مَا وَضَعَهُ فقَالَ إِنَّهُ قد أذِنَ لكُنَّ أن تخرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ[1]، واتە: (عائشة) دەڵێ: لەپاش ئەوەی کە (حجاب) لەسەرمان فەرز کرا (سودة) ڕۆیشتە دەرەوە بۆ سەرئاو، ئافرەتێکی قایمو قوڵو بالآبەرز بوو، لەناو ئافرەتاندا دیاربوو، نەدەشارایەوە لە کەسێك کە بیناسیایە، (عمر)ی کوڕی (الخطاب) بینی وتی: ئەی (سودة ) بەخوا لێمان ون نابیت ئیتر بزانە چۆن دەچیتە دەرەوە، ئەویش گەڕایەوە، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە ماڵی مندا بوو نانی ئێوارەی دەخواردو ئێسقانێکی بەدەستەوە بوو، (سودة) هاتە ژوورەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من چوومە دەرەوە (عمر) ئەوەو ئەوەی پێوتم، (عائشة) دەڵێ: (وحي) هات بۆ پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم پاشان تەواو بوو، هێشتا ئێسقانەکەی دەستی دانەنا بوو، فەرمووی: ئێوە ژنان مۆڵەتتان پێدراوە، کە بۆ پێویستیەکانتان بچنە دەرەوە.

٥- زۆر گوێڕایەڵ بوو: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا أنهَا قالت اختصَمَ سَعْدُ بْنُ أبِي وَقاصٍ وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلامٍ فقَالَ سَعْدٌ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْنُ أخِي عُتبَةَ بْنِ أبِي وَقاصٍ عَهِدَ إِلَيَّ أنهُ ابْنُهُ انظرْ إِلَى شَبَهِهِ وَقالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ هَذَا أخِي يَا رَسُولَ اللَّهِ وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ فنظرَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِلَى شَبَهِهِ فرَأى شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتبَةَ فقَالَ هُوَ لكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ الوَلَدُ لِلفِرَاشِ وَلِلعَاهِرِ الحَجَرُ وَاحْتجِبِي مِنهُ يَا سَوْدَةُ بِنتَ زَمْعَةَ قالت

---

١) رواه البخاري: ٤٤٢١، ومسلم: ٤٠٣٤ .

فلَمْ يَرَ سَوْدَةَ قطُّ[1]، واته: واته: (عائشَة) دەڵێت: جارێکیان (سعد)ی کوڕی (أبو وقاص)و (عبد)ی کوڕی (زمعة) لەبارەی منداڵێکەوە بوو بە مشتومڕیان (سعد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم منداڵە برازامە منداڵی (عتبة)ی کوڕی (أبو وقاص)ە، وەسیەتی بۆ کردووم کە ئەمە کوڕی خۆیەتی، سەیری شێوەی بکە؟! (عبد)ی کوڕی (زمعة)ش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم کوڕە برای منە، لە کەنیزەکەکەی باوکمە، پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم سەیرێکی منداڵەکەی کرد، بینی بەئاشکرا لە (عتبة) دەچێ، فەرمووی: ئەی (عبد) ئەم منداڵە هی تۆیە، چونکە منداڵ ڕۆڵەی تێکەڵی باوكو دایکە، مرۆڤی داوێن پیسیش جگە لە پەشیمانیو ڕەنج بەفیڕۆیی هیچی کەی دەست ناکەوێ، ئینجا بە (سودة)ی کچی (زمعة)ی فەرموو: ئەی (سودة)ی کچی (زمعة) ئیتر تۆش خۆتی پیشان مەدە، (عائِشَة) دەڵێت: جارێکی تر (سودة)ی نەبینی.

٦- دونيا نەويست بوو: عن ابن سيرين: أن عمر بعث إلى سودة بغرارة دراهم. فقالت: ما هذه ؟ قالوا: دراهم. قالت: في الغرارة مثل التمر ! يا جارية: بلغيني القنع، ففرقتها.[2]، واته: (محمد)ی کوڕی (سيرين) دەڵێ: عمر -خوای لێ ڕازی بێ – تورەکەیەك (درهم )ی نارد بۆ (سودة).

وتی: ئەمە چییە ؟

وتیان: (دراهم) پارەیە.

وتی: لە تورەکەدا وەك خورما ! کچۆڵەکە بمگەیەنە (القنع)، ئینجا لەوێ هەمووی بەخشی.

---

١) رواه البخاري: ٦٢٦٨ ومسلم: ٢٦٤٥ .

٢) قال إبن حجر في الإصابة (٢١٧/١٢): رواه إبن سعد بسند صحيح، وقال شعيب الأرناؤوط في سير أعلام النبلاء (٢٦٩/٢): رجاله ثقات.

٧-له پاش پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم له ماڵەکەی خۆیدا ئۆقرە دەگرێت:

عن أبي واقد الليثي أنه قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول لأزواجه في حجة الوداع: هذِه، ثمَّ ظُهُورَ الحُصُرِ[1]، وقال (أبو هريرة): وكنَّ كلهنَّ يحجُجنَ إلا زينب بنت جحش و سودة بنت زمعة رضي الله عنهنَّ وكانتا تقولان والله لا تحرّكنا دابة بعد إذ سمعنا ذلك من النبي صلى الله عليه وسلم[2]، واتە: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیست لە حەجی ماڵئاواییدا بە خێزانەکانی فەرموو: (پاش ئەم حەجە نۆرەی دانیشتنە لەسەر حەسیرەکان)، واتە: لە ماڵەکانی خۆتاندا بسرەوون و ئۆقرە بگرن و بۆ کاری پێویست نەبێ لە ماڵەکانتان دەرنەچن) (أبوهريرة) دەڵێت: دوایی خێزانەکانی هەموویان حەجیان دەکرد (زينب)ی کچی (جحش)و (سودة)ی کچی (زمعة) نەبێت - خوا لە هەموویان ڕازی بێت – هەردووکیان دەیانفەرموو: سوێند بەخوا نابێ سواری وڵاخ بین و بمانجولێنێ پاش ئەوەی لە پێغەمبەری خوامان صلى الله عليه وسلم بیستووە کە لە ماڵەوە دەرنەچین.

٨- ئافرەتێکی لێبوردەبوو: خَلیسة) دەڵێت: جارێکیان (حفصة)و (عائشة) بەگاڵتەوە وتیان بە (سودة)- خوا لێیان ڕازی بێ-: (دجّال) هاتووە !

(سودة)ش بەپەلە لە ژوورێکدا کە ئاگری تێدا دەکرایەوە خۆی شاردەوەو ئەوانیش دەستیان کرد بە پێکەنین، ئینجا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات، فەرمووی: ما شأنكما ؟ ( ئەوە چیتانە)؟ ئەوانیش بۆیان گێڕایەوە پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ڕۆیشت بۆ لای.

---

١) رواه أبو داود و صححه الألباني في السلسلة الصحيحة ٢٤٠١.

٢) حسنه الألباني في الترغيب والترهيب: (٢/٢٢٠ برقم: ١١٦٧)و الأرناؤوط في مسند أحمد: (٦/٣٢٤ برقم : ٢٦٧٩٤) .

(سـودة) پێـی گـوت: يـا نَبـيَّ اللهِ، خَـرَجَ الْأعْـوَرُ الدَّجَّـالُ ؟ (ئـەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئایا دجّال هاتووه)؟

فـەرمووی: لا، وكـأن قـد خـرج. ( نـەخێر، بـەلاّم وەك ئـەوە وایـە هاتبێت).

ئینجا (سودة) هاتە دەرەوە پەتی جاڵجاڵۆکەی لەخۆی دەکردەوە[1].

## ژمـارەی ئەو فەرموودانەی گـێڕاویەتییـەوە

پێـنج فـەرموودەی لـە پێغەمبـەرەوە صـلى الله عليـە وسـلم گێڕاوەتـەوە یەکێکیان لە (صحيح البخاري) دایە:

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ سَوْدَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صلى الله عليـه وسلم قَالَتْ مَاتَتْ لَنَا شَاةٌ فَدَبَغْنَا مَسْكَهَا ثُمَّ مَا زِلْنَا نَنْبِذُ فِيهِ حَتَّى صَارَ شَنًّا[2]، واتە: کاوڕێکـمان هەبوو مـردار بوویـەوە، پێستەکەیمان خۆشکردو پاشان بە بەردەوامی بۆ خواردنەوە بەکارمان دەهێنـا تاوەکـو کـۆن بوو.

## کـۆچی دوایـی (سـودة)

(سـودة) خـوای لـێ ڕازی بێـت لـە کۆتـایی (خِلافـة)ی (عمـر)ی کـوڕی (الخطاب)دا کۆچی دوایی دەکـات.

---

١) اخرجـه أبو نعيـم فـي معرفـة الـصحابة: (١١٥/٢٣) وذكـره إبـن الأثيـر فـي أسد الغابـة: (٧/ ٩٧)، و ابن كثيـر البداية والنهاية: (٣٤٨/٥).

٢) رواه البخـاري: (٦١٩٢).

# عائیشەی کچی ئەبوبەکر خوایان لێ ڕازی بێ[١]

**کەسـایەتی دایکـی ئیمـانداران (عائشـة):**

نــاوی: (عائشـة)ی کچی (أبو بکر)ی (الصدیق).

نازنـاوی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم بـە (یـا عـائش)[٢] و (یـا بنـت الـصدیق)[٣] و (یـا بنـت أبـي بکـر)[٤] و (یـا حمیــراء)[٥] و (یـا موفقـة)[٦] بـانگی لێکــردووە.

نازنـاوی (کنیــة)[٧]ی: جارێکــیان (عائــشة) بــە پێغەمبــەری خــوای صــلی الله علیه وسلم گوت: کلّ نـسائك لـها کنیـة غیــري، فقـال لـها رسـول الله صلی الله علیه وسلم: اکتنـي أنـت أم عبـد الله. فکـان یقـال لهـا: أم عبـد الله حتـی مــاتت

---

١) الإصــابة: (١٢/ ١٥٥- ٢٥٧)، سیــر أعــلام النــبلاء: (٢/١٣٥-٢٠١)، أسـد الغابــة: (٧/٢٠٥- ٢٠٨)، الأعلام: (٣/٢٤٠)، البدایة والنهایة: (٨/٩٨-١٠١)، وفیات الأعیان: (٣/١٦- ١٩).

٢) البخاري ٣٤٨٤ ومسلم ١٦١٩.

٣) السلسلة الصحیحة: ١٦٢.

٤) صحیح ابن ماجة للألباني: ٣٣٨٤.

٥) السـلـسلة الـصحیحة: ٣٢٧٧، (الحمیــراء): واتــە (یـا بیـضـاء)، عـەرەب بـە سـپی پێـستیان وتووە: أحمــر، حمــراء. بڕوانە: لسـان العــرب: (١٣/٤٣١).

٦) ضعفه الألبـاني في مشـکاة المصابیح: ١٧٤٣.

٧) (کنیـة): واتـە بـانگکردنی کەسێك بـەناوی کەسێکی تـرەوە، مەبەسـت پێـی ڕێزلێنانـە، دەبێت بە یەکێك لەم وشانە دەست پێبکات: (أب، أم، ابن، بنت، أخ، أخت، عم، عمة، خـال، خالة) بڕوانە: المعجم الوسیط: (٢/٨٠٢)

ولـم تلــد قــط[1]، واتـه: هـەموو خێزانـەكانت نازنـاو (كنيـة)يـان هەيـه مـن نـەبێت. فـەرمووی: (أم عبـدالله) بكـه بـه (كنيـة) بۆخـۆت. (واتـه: (عبداللـه)ی خوشكەزای) ئەوەبوو تا كۆچی دوایی كـرد، بـه (أم عبـدالله) ناوئـەبراو هـەرگيز منالێشــی نەبوو.

بـاوكی: (عبداللـه)ی كـوڕی (أبـو قحافـة)ی كـوڕی (عـامر)ی كـوڕی (عمـرو)ی كوڕی (كعـب)ی كوڕی (سـعد)ی كوڕی (تيـم)ی كـوڕی (مرة)ی كوڕی (كعب)ە.

كەوابوو (عائشـة)ی دایكی ئیمانداران خوای لـێ ڕازی بێ بەرەچەڵەك لەگـەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم له (مرة)ی كوڕی (كعب)دا يەكدەگرنەوە.

دايكی: (أم رومان)ی كچی (عميـر)ی كوڕی (عامر)ی كوڕی (دهمـان)ی كـوڕی (الحـارث)ی كـوڕی (غـــنم)ی كـوڕی (مالـك)ی كـوڕی (كنانـة)يـه، پـاش كۆچـی دوایی هاوسەرەكەی (عبد الله)ی كوڕی (الحارث)ی (الأزدي)، (أبوبكر) خوازبێنی دەكـاتو لـه سـەرەتای هـاتنی ئیـسلامدا موسـڵمان دەبێـتو كـۆچ دەكـات بـۆ (مدينة)و، له خیلافەتی (عثمان)ی كوڕی عفان دا كۆچی دوایی دەكات.[2]

**لەدایكـبوونی :**

له ماڵێكی پـڕ لـه ئیمانـدا، چوار سـاڵ دوای پێغەمبەرايـەتی محمـد صـلى الله عليـه وسـلم لـه دايـك دەبێـت، هـەر خـۆی دەڵـێ: لم أعقـل أبـوي قـط إلا وهمـا يدينـان الدين[3]، واته: هێشـتا دايـكو بـاوكم نەدەناسـی (لەبـەر منـداڵی) ئـەوان شوێن كەوتووی ئەم دينــه بوون.

---

١) السلسـلة الصـحيحة: ١٣٢ .

٢) هەندێكی تر له زانايان پێيـان وايـه لـه سـاڵی (٤ يـان ٥ يـان ٦)ی كۆچيدا كۆچی دوايی كردووە، بەڵام ڕای يەكەم بەهێزترە. بڕوانە: فتح البـاري: (٤٣٨/٧- ٤٣٨).

٣) رواه البخـاري: (٤٥٦).

## خوازبێنــی كــردنی:

ســەرەتای ئــەم خوازبێنیــە نیگــا (وحــي) بــوو لەلایــەن پــەروەردگارەوە بــۆ پێغەمبەرەکــەی صــلی الله علیــە وســلم عائــشة خــوای لــێ ڕازی بــێ خــۆی دەیگێڕێتەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ ثَلاثَ لَيَالٍ جَاءَنِي بِكِ الْمَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ فَيَقُولُ هَذِهِ امْرَأَتُكَ { هذه زوجتك في الدنيا والآخرة }[1] فَأَكْشِفُ عَنْ وَجْهِكِ فَإِذَا أَنْتِ هِيَ فَأَقُولُ إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ[2]، واتە: سێ جار تۆم نیشاندرا لەخەودا، فریشتەیەك تۆی هێنا بۆ لام لە پارچەیەك ئاوریشمدا، وتی: ئەمە خێزانەکەتە، سەیری دەموچاوم کردیت تۆ بوویت، منیش وتم: ئەگەر ئەم خەوە لە خواوە بێت دەیهێنێتە دی.

نزیکەی دوو ساڵێك بەسەر ئەم خەوەدا تێپەڕی‌و (خدیجة) خوای لێ ڕازی بێ کۆچی دوایی کرد، زۆری پێنەچو (خولة)ی کچی (حکیم) هاتە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم باسی (عائشة)و (سودة)ی لا کردو ئەویش فەرمووی: دەی بچۆ هەردووکیانم بۆ داوا بکە ...[3]

ئەوەبوو هەردووکیانی بۆ خوازبێنی کردو هەر لە هەمان ساڵی کۆچکردنی (خدیجة)دا هەردووکیانی مارەبڕی‌و (سودة)ی گواستەوە، بەڵام (عائشة)ی لە مانگی (شوال)ی ساڵی یەکەمی کۆچیدا لە (مدینة) گواستەوە.

---

١) السلسلة الصحيحة: ٣٩٨٧.

٢) رواه البخاري: ٣٦٠٦ و مسلم: ٤٤٦٨ واللفظ له.

٣) بڕوانە خوازبێنی کردنی دایکی ئیمانداران (سودة)ی کچی( زمعة).

## کۆچکـردنی بـۆ (مدینــة):

(عائشـة) خوای لـێ ڕازی بێ دەڵـێ: لـە قرچەی گەرمـای نیـوەڕۆدا لـە مـاڵی (أبو بکر) دانیشـتبووین، کەسێك وتـی بـە (أبـو بکـر) ئـەوە پێغەمبـەری خوایـە صلى الله عليه وسلم، سەروچاوی داپۆشـیوە، ئەمـە لەکاتێکدا بـوو کـە هـەرگیز لەوکاتەدا نەدەهات بۆ ماڵمان، (أبو بکـر وتـی): بـاوكو دایکـم بـەقوربانی بێـت، سوێند بەخوا شتێکی گرنگ ڕوویـداوە لـەم کاتـەدا هـاتووی، ئینجا پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم هـاتو لەگـەڵ (أبـوبکر)دا ڕێکـەوتن لەسـەر پلانـی کۆچـکردن، (عائـشـة) دەڵـێ: ئێمـەش بـە چاکتـرین شـێوە کەلوپەلـمان بـۆ ئامـادەکردن، توێـشوومان بـۆ دروسـتکردنو خـستمانە نـاو چـەرمەوە بۆیـان، (أسماء)ی کچی (أبو بکر) بە لەتێکی پـشتێنەکەی خـۆی دەمـی چـەرمەکەی بـۆ بەستن لەبەر ئەوە پێی دەوترا خـاوەنی دوو پشـتێنەکە (ذات النطـاقين)[1].

پـاش ماوەیـەکی کـەم (عائـشة)و (أم رومـان)ی دایکـی و (أسمـاء)ی خوشـکی لەگـەڵ (عبدالله)ی برایـدا کۆچ دەکـەن بۆ (مدینة) بـە (أبـوبکر) شـاد دەبنـەوە، خوا لە هەموویـان ڕازی بێـت.

## گواسـتنەوەی لە مانگـی (شـوال)ی سـاڵی (١)ی کۆچیتدا

(عائشــة) خوای لـێ ڕازی بێ خۆی باسی ڕۆژی گواستنەوەی دەکاتو دەڵێت: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم لِسِتِّ سِنِينَ وَبَنَى بِي وَأنَا بِنْتُ تِسْعِ سِـنِينَ قَـالَـتْ فَقَدِمْنَـا المَدِينَــةَ فَوُعِكْتُ شَـهْرًا فَوَفَى شَـعْرِي جُمَيْمَةً فَأَتَتْـنِـي أُمُّ رُومَـانَ وَأَنَــا عَلَى أُرْجُوحَــةٍ وَمَعِــي صَــوَاحِبِي فَصَـرَخَتْ بِـي فَأَتَيْتُهَــا وَمَـا

١) رواه البخاري: (٣٧١٤).

أدري مَا تريدُ بي فأخَذَت بيَدِي فأوقفَتـني عَلى البَابِ فقلتُ هَـهْ هَـهْ حَتى ذَهَبَ نَفَسِي فأدخَلتنِي بَيتـا فإذَا نِسـوَةٌ مِن الأنصَـارِ فقلنَ عَلى الخَيْـرِ وَالبَرَكـةِ وَعَلى خَيْـرِ طَـائرِ فأسْـلمَتنِي إليهِـنَّ فغَسَلنَ رَأسِي وَأصلحْنَنِي فلمْ يَرُعنِي إلّا وَرَسُـولُ اللّهِ ضُحَى فأسـلمْنَنِي إليـه[1]، واتـه: لـه شـهش سـاڵیدا پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم مـارەی کـردمو، لـه نـۆ ساڵیـشدا گواستمیەوە. دەڵێت: کە هاتینـه (مدینـة)وە مانگـێك نـەخۆش کەوتم تـازە قـژی بناگـوێم ڕوابویـەوە (پێشتـر بـەهۆی نەخۆشیەوە وەریبـوو)، دایکـم هـات بۆلام و منیش سـواری جۆلانە بووبـووم لەگـەڵ هاوڕێکـانمـدا، هـاواری لـێکردمو، منـیش هـاتم بەدەمیـەوەو، نەشمـدەزانی منـی بـۆ چییـە، دەستی گـرتم تـا هێنامیـه بـەر دەرگاکـەو وەسـتاندمی. منـیش وتم: هـه هـه تاوەکـو هەناسـەکەم وەسـتایەوەو، بردمیــه ماڵێکـەوە، کـه چـەند ژنێکـی پـشتیوان (أنصـاري) لەوێ بوون، وتیـان لەسـەر خـەیرو بەرەکەتو بـەختێکی چاك بـێ، ئیتـر دامی یه دەسـتیانو، کـتوپڕ سـەریان شـۆردمو ڕێـكو پێکـیان کـردمو بۆ چێشتـەنگاو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتو دامیانە دەستی.

جا خوێنەری بەڕێز:

یـەکێك لـەو گومانانـەی ناحـەزان باسـی لێـوە دەکـەن شـووکردنی دایکـە (عائشـة)یە بە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم لـه تەمـەنی (٩) سـاڵیدا، گوایە ئەم تەمەنە کەمبووەو گونجاو نەبووە بۆ شـووکردن !

بۆیە بەکورتی لە چەند خاڵێکـدا وەڵامی ئەم گومـانە دەدەینەوە[2]:

١- ئـەم ژن هێنـانە بـه فـەرمانی خـوای گـەورە بـووە، سـێ شـەو لـه خـەودا (عائـشة) پیـشانی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم دراوە، وەك لـه

---

١) رواه مسـلم: ٢٥٤٧.

٢) کتێبی (عائیشە) دایکی ئیمانداران لەنێوان دۆستانو نەیاران ل ١٥٦-١٥٧ بە دەستکاریەوە.

فەرموودەكــەدا ڕوونمــان كــردەوە، گومانیــشی تێــدا نیــە، كــە خــەوی پێغەمبەران بەشـێكە لە نیگـا (وحي).

٢- ئافرەتێكی شارەزاو بە سەلیقەی وەك (خولة ی كچی حكیم) دەست نیـشانی دەكات بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسلم، ئەگەر تەمـەنی (عائـشـة) خـوای لـێ ڕازی بێـت بـۆ شـووكردن نەگونجابایـە (خولـة) چۆن ئـەم كـارەی دەكرد ؟!

٣- ئــەوەشمان لــەیاد نەچێــت كــە (عائــشة) خــوای لــێ ڕازی بێــت پێــشتـر خوازبێنی كرابوو بۆ(جبیـر)ی كوڕی (مطعـم)ی كوڕی (عـدي)، دیـارە دایكـە (عائشـة) پێگەیشتوو بووە بۆیە داخوازی كراوە !

٤- لـەنێو خەڵـكی (مكـة) كاتێـك ئـەم شـووكردنە ڕاگەیـەنرا كـەس نكوڵی لـێ نەكردو بەشتێكی سەیریان نەزانی، لەكاتێكدا بێبـاوەڕان بـەردەوام خـەریكی دژایەتیكردن بوونو تۆمەتی سەیرو سەمەرەیان دەدایە پاڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

٥- ئەم خوازبێنیە یەكەم خوازبێنی نـەبووە لـەناو عەرەبـدا كـە تەمـەنیان بـەم شـێوەیە لەیـەك جیـاواز بـێ، بەڵـكو شـتێكی بـاوبووە لـەو سـەردەمەدا، بـۆ نموونە:

(عمر)ی كـوڕی (الخطـاب) خـوازبێنی كـچێكی (علـي) كـوڕی (أبـو طــالب) دەكـات لەكاتێكـدا تەمـەنی (عمــر) لـە (علـي) زۆر زیـاترە خوایـان لــێ ڕازی بێت.

هەروەها (عمر)ی كوڕی (الخطاب) كـچێكی گـەنجی خـۆی (حفـصة) دەداتـە (أبـو بكــر) بۆئــەوەی خــوازبێنی بكـــا لەكاتێــدا جیــاوازی تەمــەنیان، وەك جیاوازی نێـوان تەمـەنی پێغەمبـەری خـواو صـلی الله علیـه وسلم (عائـشــة) وایــە.

## پلەو پایەو تایبەتمەندییەکانی

١- (جبریل) سەلامی لێکردووە: (عائیشە) خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: يَا عَائِشَ هَذَا جِبْرِيلُ يُقْرِئُكِ السَّلَامَ فَقُلْتُ وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ تَرَى مَا لَا أَرَى تُرِيدُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم[1]، واتە: عائیشە! ئەوە (جبریل)ە سەلامت لێدەکات، دەڵێ: منیش وتم: سەلامو بەزەیی خوا لەویش بێت، شتێك دەبینی من نایبینم.

٢- ئافرەتێکی کامڵ بووە: (أبو موسى) خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ[2]، واتە: (پیاوان زۆریان لێ کامڵ بوون، بەڵام ئافرەتان کامڵیان تیا نەبووە، جگە لە (مەریەم)ی کچی (عمران)و (ئاسیا)ی ژنی (فرعون)، ڕێزی (عائیشە)ش بەسەر ئافرەتانی تر وەك ڕێزی تێکوشین بە گۆشت وایە بەسەر خواردنەکانی تردا.

٣- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زۆری خۆشویستووە: - عَنْ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم بَعَثَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السُّلَاسِلِ فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ ؟ قَالَ: عَائِشَةُ فَقُلْتُ مِنَ الرِّجَالِ فَقَالَ أَبُوهَا قُلْتُ ثُمَّ مَنْ قَالَ ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَعَدَّ رِجَالاً.[3]، واتە: (عمرو)ی کوڕی (العاص) دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ناردمی بۆ فەرماندەیی سوپای (ذَاتِ السُّلَاسِلِ)، هاتمە خزمەتی وتم: کێ

---

١) رواه البخاري: ٣٤٨٤، و مسلم: ٤٤٨ .
٢) رواه البخاري: ٣١٥٩، و مسلم: ٤٤٥ .
٣) البخاري: ٣٣٨٩، ومسلم: ٤٣٩٦ .

خۆشەویسترین کەسە لەلات؟ فەرمووی: (عَائِشَة)، وتم: لە پیاوان ؟ فەرمووی: باوکی، وتم: ئەی پاش ئەو؟ فەرمووی: (عمر)، ئنجا ناوی چەند پیاوێکی برد.

- قالت عائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إنِّي لأعلمُ إذا كُنتِ عَنّي رَاضِيَةً وَإِذا كُنتِ عَلَيَّ غَضْبَى قالت فقلتُ مِنْ أينَ تعرفُ ذلِكَ فقالَ أمَّا إذا كُنتِ عَنّي رَاضِيَةً فإنّكِ تقولينَ لا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ وَإِذا كُنتِ عَلَيَّ غَضْبَى قُلتِ لا وَرَبِّ إبرَاهِيمَ قالت قُلتُ أجَلْ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أهْجُرُ إلَّا اسْمَكَ[1]، واته: (عائشة) دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (من دەزانم چ کاتێك تۆ لێم ڕازیت، چ کاتێك لێم زویریت)، دەڵێ: منیش وتم چۆن دەزانیت؟ فەرمووی: (بەوا دەزانم هەر کاتێك لێم ڕازی بیت دەڵێی: نەخێر بە خوای محمد صلی الله علیه وسلم، هەرکاتێك لێم زویر بیت دەڵێی: نەخێر بە خوای (إبرَاهِيم) دەڵێ: وتم: بەڵێ بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەنها ناوەکەت واز لێ دێنم.

- (عائشة) دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم (فاطمة)ی کچی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم نارد بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، داوای مۆڵەتی لێکرد لەکاتێکدا لەگەڵ مندا لەژێر نوێنەکەمدا ڕاکشابوو، مۆڵەتیان پێدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ژنەکانت منیان ناردووە بۆلات داوای یەکسانیت لێدەکەن سەبارەت بە کچەکەی (أبو قحافة)، منیش بێدەنگ بووم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: أي بنية ألست تحبين ما أحب؟ (کچەکەم ئایا هەرکەس من خۆشم بوێ تۆش خۆشت ناوێ ؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: فأحبي هذه. واتە: دەی (عائشة)ت خۆش بوێ.

---

١) البخاري: ٤٨٢٧، و مسلم: ٤٦٦٩.

كاتێك (فاطمة) ئەمەی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بیست هەستاو گەڕایەوە بۆ لای خێزانەكانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، هەواڵی دانێ كەخۆی چی وتووەو پێغەمبەری خواش صلی الله علیە وسلم چی وەڵام داوەتەوە.

ئەوانیش گوتیان: هیچت بۆ نەكردین، بگەڕێرەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم و پێی بڵێ: ژنەكانت لەبەرخوا داوای یەكسانیت لێدەكەن سەبارەت بە كچەكەی (أبو قحافة)، ئەویش وتی: سوێند بەخوا هەرگیز لەوبارەوە هیچی كەی پێ ناڵێم.

(عائشة) دەڵێ: ئەمجارە (زینب)ی كچی (جحش)ی خێزانی پێغەمبەریان صلی الله علیە وسلم نارد، كە لەناو هاوسەرەكانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم ئەو لە هەموویان زیاتر پێشبڕكێی ئەوەی لەگەڵ دەكردم كە لەلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم خۆی بەرێتە پێشەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ژنێكم نەدیوە لە دینداریدا لە زەینەب چاكترو، بە تەقواترو، ڕاستگۆترو، پەیوەندی خزمایەتی گەیەنەرترو، بەخشندەترو، خۆبەختكەرتر بێت بۆ ئەو چاكەیەی كە لە خوا نزیكی دەخاتەوە، جگە لەوەی كە دەمارێكی تووڕەیی هەبوو خێرا لێی پەشیمان دەبووەوە.

(زینب) هات داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم كرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەگەڵ (عائشة)دا وەك ئەو كاتەی كە (فاطمة) هاتە لایان، لەژێر نوێنەكەی (عائشة)دا لەگەڵی ڕاكشابوو، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم مۆڵەتیدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ژنەكانت منیان ناردووە بۆ لات داوای یەكسانیت لێدەكەن سەبارەت بە كچەكەی (أبو قحافة).

پێغەمبەری خوایش صلی الله علیه وسلم بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی: {إنَّهَا ابْنَةُ أبي بَكْرٍ...}[1]، واتە: ئەوە کچی (أبو بکر)ە}.

- (عائشة) خوای لێ رازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەرکات سەفەری بکردایە تیروپشکی دەکرد لەنێوان خێزانەکانیدا، جارێك تیروپشکەکە بۆ (عائشة)و (حفصة) دەرچوو، هەردووکیان لەگەڵی دەرچوون، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەگەر بە شەو دەرچووبایە لەگەڵ (عائشة) دەڕۆشتو قسەی لەگەڵ دەکرد، جارێکیان (حفصة) بە (عائشة)ی وت: بۆ تۆ سواری وشترەکەی من نابیتو منیش سواری وشترەکەی تۆ بم، تا هەردوکمان بزانین چی ڕوو دەدات ؟

(عائشة) وتی: بەڵێ، (عائشة) سواری وشترەکەی (حفصة) بوو، (حفصة)یش سواری وشترەکەی (عائشة) بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لای وشترەکەی (عائشة)،(حفصة)ی لەسەربوو سەلامی لێکردو لەگەڵی ڕۆیی تاوەکو دابەزین،(عائشة) پێغەمبەری لێونبوو غیرەت گرتی، پێی دەخستە ناو دڕكو دەیگوت: ئەی پەروەردگار دوپشکێ، یان مارێکم بۆ بنێرە بمگەزێت ئەوە پێغەمبەری تۆیەو ناتوانم هیچی پێ بڵێم[2].

- عن ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ: دَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ فَقَالَ يَا بُنَيَّةِ لَا يَغُرَّنَّكِ هَذِهِ الَّتِي أَعْجَبَهَا حُسْنُهَا حُبُّ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِيَّاهَا يُرِيدُ عَائِشَةَ فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَتَبَسَّمَ[3]، واتە: (إبن عباس) دەڵێ: (عمر) چوو بۆ لای (حفصة)و پێی گوت: کچۆڵەکەم نەتخەڵەتێنێ ئەو کەسەی، کە جوانیەکەی چووە بە دڵی

---

١) رواه مسلم: (٤٤٧٢).
٢) البخاري: (٤٨١٠)، و مسلم: (٤٤٧٧) .
٣) رواه البخاري: (٤٨١٧) .

پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم مەبەستی (عائشة) بوو، (إبن عباس) دەڵێ گێڕامەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەویش زەردەخەنە گرتی.

- قالت عَائِشَةَ كُنتُ أشرَبُ وَأنَا حَائِضٌ ثمَّ أنَاوِلُهُ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم فيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ فَيَشرَبُ وَأتَعَرَّقُ العَرْقَ وَأنَا حَائِضٌ ثمَّ أنَاوِلُهُ النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَ.[1]، واتە: (عائشة) دەڵێ: من لە حەیزدا بووم ئاوم دەخواردەوە، پاشان دەمدایە دەستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەمی دەخستە سەر شوێن دەمی منو دەیخواردەوە، هەروەها لە حەیزدا بووم قەپم دەگرت لە ئێسكە گۆشتو دەمدایە دەستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەویش دەمی دەخستە شوێن دەمی منو دەیخوارد.

٤- پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشبڕكێی لەگەڵ كردووە: قالت عائشة: سابقني النبي صلى الله عليه وسلم فسبقته ما شاء، حتى إذا رهقني اللحم، سابقني، فسبقني، فقال: يا عائشة هذه بتلك[2]، واتە: (عائشة) دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێشبڕكێی لەگەڵ كردم (ڕاكردن)، لێم بردەوە، بەڵام كاتێك قەڵەو بووم دووبارە پێشبڕكێی لەگەڵ كردمەوە لێی بردمەوەو فەرمووی: ئەمە لە بری ئەو.

٥- بە هۆی دایكە (عائشة)وە ئایەتی (التيمم) دابەزی: (عائشة) خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە سەفەرێكیدا دەرچووین، تا گەیشتینە (بیداء) یا (ذات الجيش) لەوێ

---

١) رواه مسلم: (٤٥٣) .

٢) رواه أحمد في مسنده: (٣٩/٦، و٢٦٤)، وأبو داود: (٢٥٧٨) وابن ماجة: (١٩٧٩)، والنسائي: (٢/٧٤)، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة: (١٣١).

ملوانکەکەم لێ پچڕا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مایەوە بۆ دۆزینەوەی، خەڵکەکەش لەگەڵی مانەوە، لەو شوێنەشدا نە ئاو هەبوو نە ئەوانیش ئاویان پێبوو، خەڵکەکە چوون بۆ لای أبوبکر، وتیان: نابینی (عائشة) چی کرد؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و ئەم خەڵکەشی لەگەڵدا هێشتووەتەوە، نە نزیکی ئاوێکن‌و نە ئاویشیان پێیە؟ (أبوبکر)یش هات‌و لەوکاتەشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەری خستبووە سەر ڕانم‌و خەوی لێکەوتبوو، وتی: پێغەمبەری خواو صلی الله علیه وسلم ئەم خەڵکەت لێرە گیرداوە، نە نزیکی ئاون‌و نە ئاویشیان پێیە ؟

(عائشة) دەڵێ: (أبوبکر) سەرزەنشتی کردم‌و ئەوەی خوا ویستی پێی وتم‌و سیخورمەی دەدا لە کەلەکەم، منیش لەبەر ئەوەی سەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر ڕانم بوو نەدەجولام، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو شەوە تابەیانی لەوێ خەوت، کاتێ هەستا ئاو نەبوو، خوای گەورە ئایەتی (التیمم)ی نارده خوارەوە، هەموویان (تیمم)یان کرد، (أُسَید)ی کوڕی (الحُضَیر)، کە یەکێك بوو لە سەردار (نقیب)ەکان وتی: جَزَاكِ اللهُ خَيْرًا فَوَاللهِ مَا نَزَلَ بِكِ أَمْرٌ قَطُّ إِلاَّ جَعَلَ اللهُ لَكِ مِنْهُ مَخْرَجًا وَجَعَلَ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ بَرَكَةً [1]، خوا پاداشتی خێرت بداتەوە، هیچ گرفتێك نەبووە توشت بێت ئەوا خوای گەورە هەر دەروویەکی لێکردوویتەوەو بۆ موسڵمانانیشی بەخێر گێڕاوە.

(عائشة) وتی: کاتێك ئەو وشترەمان هەستاند، کە لەسەری بووم، ملوانکەکەمان لەژێریدا دۆزییەوە.

٦- خەڵك لە ڕۆژی (عائشة)دا دیاریەکانیان دەنارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (هشام) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: خەڵك بەدوای

---

١) رواه البخاري: (٣٣٦)، ومسلم: (٨٤٢ - ٨٤٣) واللفظ لـه.

ئـەوەدا دەگـەڕان لـە ڕۆژی (عائـشة)دا دیاریـەکانیان بنێـرن، (عائـشة) وتـی: هاوڕێکـانم لای (أم سلمة) کۆبونەوە وتیان: ئەی (أم سـلمة) سـوێند بـە خـوا خەڵکی بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن لە ڕۆژی (عائشة)دا دیاریـەکانیان بنێـرن و ئێمەش حەزمان لەو خۆشیەیە وەك چۆن (عائشة) حەزی لێیەتی، بڕۆ بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسلم بـا بـە خەڵـکی بڵـێت لـە هـەر ماڵێك لە ماڵەکانی بوو دیاری بۆ بنێرن، (عائـشة) دەڵێ: (أم سـلمة) ئەوەی بـە پێغەمبـەری صـلی الله علیـه وسـلم وت، (أم سلمة) وتـی پـشتی لێکـردم، کاتێـك ڕووی لێکردمـەوە پـێم وتـەوە دیـسان پـشتی لێکردمـەوە، بـۆ جـار سێیەم پێی فەرمووم: یَـا أُمَّ سَـلَمَةَ لَـا تـُؤْذِينِي فِـي عَائِـشَـةَ فَإِنَّـهُ وَاللَّـهِ مَـا نَـزَلَ عَلَـيَّ الْوَحْيُ وَأَنَـا فِـي لِحَـافِ امْـرَأَةٍ مِنْكُـنَّ غَيْرِهَـا[1]، واتـە: ئـەی (أم سـلمة) سـەبارەت بـە (عائـشة)ئـازارم مـەدە سـوێند بـەخوا (وحـي)م بـۆ نەهاتووەتە خوارێ لەژێر لێفەی هیچ کام لە ئێوە جگە لە (عائشة).

٧- <u>(عائـشة) خێزانـی پێغەمبـەرە صـلی الله علیـه وسـلم لـە دواڕۆژیـشـدا</u>: عـن عائشـة أنَّ جبـريل جـاء بـصورتها فـي خرقـة حريـر خـضراء إلـى النبـي صلى الله عليـه وسـلم فقـال إن هـذه زوجتـك فـي الـدنيا والآخـرة[2]، واتـە: (عائـشة) دەڵێ: جبـریل شێوەی منی لەنێو پەڕۆیەکی سـەوزی ئاوریـشمـدا بۆ پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم هێنـاوەو فەرموویـەتی: ئەمـە خێزانـی تۆیە لە دونیاو لە دواڕۆژدا .

٨- <u>پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم دوعـای بۆ کـردووە</u>: قـالت (عائـشة) لـما رأيت من النبي صلى الله عليـه وسـلم طيـب نفـس، قلـت: يـا رسـول الله، ادع الله لـي، فقـال: (اللهم اغفـر لعائـشة مـا تقـدم مـن ذنبهـا ومـا تـأخر، مـا

---

١) رواه البخـاري: ٣٤٩١ .

٢) صحيح سنن التـرمذي للألباني: ٣٨٨٠ .

أسـرت ومـا أعلنـت (فـضحكت عائـشة حتـى سـقط رأسها فـي حجرهـا مـن الضحك، قال لـها رسول الله صلى الله عليه وسـلم) أيـسرك دعـائي؟ (فقالـت: ومـا لـي لا يـسرني دعـاؤك فقـال صـلى الله عليـه وسـلم: (والله إنهـا لـدعائي لأمتي في كل صلاة)[1]، واتـه: (عائـشـة) دەڵـێ: جارێـك پێغەمبـەرم صلى الله عليـه وسـلم بـه خۆشـحاڵیەوە بینـی، وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسـلم دوعـام لای خـوا بـۆ بكـه، ئـەویش فـەرمووی: (پـەروەردگار، لـه گوناهەكانی (عائشة) خۆش به، چ گوناهی ڕابردوو چ داهاتوو، چ پەنهانیو چ ئاشكرا)، (عائشـة) ئەوەنـده پێدەكەنێ تاوەكو له پێكەنینـدا سەری كەوتـه كۆشـیەوە، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم پێـی دەفـەرموێ: (ئایـا دوعاكـەم دڵخۆشـت دەكـا؟)، وتـی: ئـەی چـۆن دڵخۆشـم ناكـات، فـەرمووی: (سوێند به خوا ئەوە دوعای منه بۆ ئوممەتەكەم له هەموو نوێژێكدا).

٩- (جبـريل) نەچووەتە ژوورەكەی لەكاتێكدا دایكـه (عائشـة) پۆشـاكی بـەری داكەندوە: (عائشـة) دەڵێ: ئەو شەوەی كه نـۆرەم بـوو پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم لام بمێنێتـەوە هـاتو عەباكـەی دانـاو نەعلـەكانی داكەنـدو لای قاچی داینـاو لایەكی كراسەكەی ڕاخسـتو ڕاكشـا، زۆری پێنەچـوو وایزانـی خەوم لـێ كەوتووە، بە هێواشی عەباكەی كۆكردەوەو نەعلەكانی لـەپێكردو لەسـەرخۆ دەرگاكـەی كـردەوەو چـووە دەرەوە دەرگاكـەی سـوك داخسـت، منـیش هەسـتام شـوێنی كـەوتم، هـەتا گەیـشتە گۆڕسـتانی (البقیـع) ئەنجـا بینـیم وەسـتاو زۆریـش وەسـتا، پاشـان سـێ جـار دەسـتەكانی بـەرزكردەوە ئەنجا گەڕایەوە، منیش گەڕامەوە، ئەو پەلەی كرد منیش پەلـەم كـرد، ئـەو زیـاتر پێـی هـەلگرت منـیش زیـاتر پـێم هـەلگرت، ئـەو ڕایكـردو منـیش ڕامكـردو پێـشی كـەوتمو چـوومە ژوورەوەو خێـرا ڕاكـشام، ئـەویش هاتـه

---

١) رواه ابن حبان و إسناده حسن، بڕوانە: السلسلة الصحيحة للألباني: ٢٢٥٤ .

ژوورەوەو فـەرمووی: مَـا لَـكِ يَـا عَـائِشُ حَـشْـيَا رَابِيَــةً ؟ {ئـەوە چیتــە (عائشة) وا هەناسـە برِكێتە}؟

منیش وتم: هیچ نیـە.

فەرمووی: لَتُخْبرِينِي أَوْ لَيُخْـبِرَنِّي اللَّطِيفُ الْخَبِيـرُ. (یان پـێم دەڵێیت، یان خوای میهرەبانی بەئاگـا پێم دەڵێت).

منــیش وتم: ئــەی پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــه وســلم ئــەی خۆشەویسـتـر لە دایكو باوكم، ئەنجا بۆم گێڕایەوە.

ئـەویش فـەرمووی: فَأَنْـتِ الـسَّوَادُ الَّـذِي رَأَيْــتُ أَمَــامِي ؟ (كەواتـە ئـەو تارماییەی لە پێشمەوە دەمبینی تۆ بویت ؟)

وتم: بەڵێ، ئەنجا هەردوو دەستی كێشا بە سنگمداو ئازاری پێ گەیاندمو فەرمووی: أَظَنَنْتِ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُــولُهُ ؟ (بۆچی واتزانـی خـواو پێغەمبەرەكەی صلی الله علیه وسلم ستەمت لێ دەكەن ؟)

منــیش وتم: هەرچـەندە خەڵـكی نهێنیـەكانیان بـشارنەوە خـوا ئاگـای لێیەتی.

فەرمووی: فَإِنَّ جِبْرِيـلَ أَتَـانِي حِينَ رَأَيْـتِ فَنَـادَانِي فَأَخْفَـاهُ مِنْـكِ فَأَجَبْتُـهُ فَأَخْفَيْتُـهُ مِنْكِ وَلَمْ يَكُنْ يَـدْخُلُ عَلَيْـكِ وَقَـدْ وَضَعْتِ ثِيَابَـكِ وَظَنَنْـتُ أَنْ قَـدْ رَقَدْتِ فَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَكِ وَخَشِيتُ أَنْ تَسْتَوْحِـشِي فَقَـالَ إِنَّ رَبَّـكَ يَـأْمُرُكَ أَنْ تَـأْتِيَ أَهْـلَ الْبَقِيـعِ فَتَسْـتَغْـفِرَ لَهُــمْ، واتـە: (جبــریل) هاتـە لام، بـانگی لــێ كـردم، لـە تـۆی شـاردەوە، منـیش وەڵامـم دایـەوەو لـە تـۆم شـاردەوە، ئـەو نەدەكرا بێتە ژوورەوە، چونكە تۆ پۆشاكەكانت دانابوو، منیش وامزانـی تـۆ خەوتویت، حەزم نەكرد خەبەرت كەمەوەو ترسـام لـەوەی كـە بـە تـەنهایی بتــرسی، پێــی وتم: پــەروەردگارت فــەرمانت پــێ دەدات بــچی بــۆ لای مردووەكانی (البقیـع)و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بكەیت.

(عائشة) دەڵێ: منیش وتم: ئەی من چۆن دوعایان بۆ بكەم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: {قُولِي السَّلَامُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَيَرْحَمُ اللَّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَلَاحِقُونَ}[1]، بڵێ: سڵاوتان لێبێ ئەی خەڵكی ئەم شوێنە لە ئیمانداران‌و موسڵمانان، خوا بەزەیی بێتەوە بەوانەمان كە زوو مردوون‌و بەوانەشمان كە هێشتا ماون، بێگومان ئێمەش هەركاتێك خوا ویستی لەسەربێت پێتان دەگەین.

١٠- بەشداری جەنگی (أحد)ی كردووە: (أنس)ی كوڕی (مالك) دەڵێ: لە غەزای (أحُد)دا (عائشة)ی كچی (أبو بَكْر)و (أمُّ سُلَيْم)(واتە: دایكی ئەنەس)م بینی خۆیان هەڵكردبوو بەجۆرێ كە پاوانەكانی قاچیانم دەبینی، كونەی ئاو لەسەر پشتیان بوو دەیانگواستەوە، پاشان خاڵییان دەكرد لە دەمی جەنگاوەراندا، پاشان پڕیان دەكردەوەو دیسان دەهاتنەوە خاڵییان دەكرد لە دەمی جەنگاوەراندا[2].

١١- پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ سەرەی (عائشة) دەگەڕا: {قالت عائِشَةُ إِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم لَيَتَعَذَّرُ فِي مَرَضِهِ أَيْنَ أَنَا الْيَوْمَ أَيْنَ أَنَا غَدًا اسْتِبْطَاءً لِيَوْمِ عَائِشَةَ فَلَمَّا كَانَ يَوْمِي قَبَضَهُ اللَّهُ بَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي وَدُفِنَ فِي بَيْتِي}[3]، واتە: (عائشة) دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ سەرەی من دەگەڕا دەیفەرموو: (من ئەمڕۆ لە كوێم ؟ من سبەینێ لە كوێم ؟) چونكە حەزی دەكرد زوو بگاتەوە ڕۆژەكەی (عائشة)، كاتێ سەرەی من هاتەوە خوای گەورە لەنێوان سنگ‌و گەردنی مندا گیانی كێشاو لە ماڵەكەی مندا نێژرا.

---

١) رواه مسلم: (٢٣٠١).

٢) البخاري: ٣٥٢٧، ومسلم: ٣٣٧٦.

٣) البخاري: ١٣٠٠، ومسلم: ٤٤٧٣ .

١٢- پەشیمانبوونەوەی لە لەخۆدانی لەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: عن عباد قال سمعت عائشة تقول: مَاتَ رَسُولُ اللّٰهِ صلى الله عليه وسلم بَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي، وَفِي دَوْلَتِي، لَمْ أَظْلِمْ فِيهِ أَحَدًا، فَمِنْ سَفَهِي وَحَدَاثَةِ سِنِّي ؟ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صلى الله عليه وسلم قُبِضَ وَهُوَ فِي حِجْرِي، ثُمَّ وَضَعْتُ رَأْسَهُ عَلَى وِسَادَةٍ، وَقُمْتُ الْتَدِمُ مَعَ النِّسَاءِ، وَاضْرِبُ وَجْهِي[1]، واتە: (عباد) دەڵێ: گوێم لە(عائشة) بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نێوان سنگو گەردنی مندا کۆچی دوایی کرد، منیش لە ئەنجامی ساویلکەییو هەرزەکاریم سەری پیرۆزیم خستە سەر سەرینێكو هەستام لەگەڵ ژناندا لە سنگو ڕومەتی خۆمم دەدا.

١٣- لە ئاسمانەوە ئەستۆپاکی بۆ هاتوە: (بخاري)و (مسلم) لە (عائشة)وە خوای لێ ڕازی بێ دەگێڕنەوە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بچوایە بۆ سەفەر، لەناو خێزانەکانیدا کامیان پشکی بەربکەوتایە لەگەڵ خۆی دەیبرد، لە یەکێك لە غەزاکاندا پاش دابەزینی ئایەتی (حجاب) تیرو پشکی کردوو من دەرچووم، منیش لەگەڵی ڕۆشتم، لەناو کەژاوەدا هەڵدەگیرام و دادەنرام، کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەجەنگەکەی بوویەوە بڕیاری گەڕانەوەی داو لە (مدینة) نزیك بووینەوە، هەرشەو بڕیاری ڕۆشتنیدا، منیش لەوکاتەدا ڕۆیشتبووم لە سوپاکە دوورکەوتبوومەوە، کاتێ بۆ دەرکردنی پێویستی خۆمم پاشان گەڕامەوە بۆ شوێنی خۆم دەستمدا لە سنگم سەیر دەکەم ملوانکەکەم پچڕابوویەوە، گەڕامەوە بۆ ئەوەی بیدۆزمەوە، لە ئەنجامدا دواکەوتم، ئەو

---

١) رواه أحمد: (٢٦٣٩١)، وحسنة الألباني في إرواء الغليل: (٨٦/٧)، و الأرناؤوط في تعليقه على مسند احمد.

چـەند کەسـەی کەژاوەکـەی منیـان بـاردەکرد، کەژاوەکـەیان هـەلگرتبوو خستبوویانە سـەر ئـەو وشتـرەی کـە سـواری بـوم، وایانـ زانیبـوو کـە منـی تێدایە، ئەو کاتە ژنـان سووکەڵـەو کەمـخۆر بوون، قەڵـەو گۆشـتن نەبوون، کاتێ کەژاوەکـەیان هـەلگرتبوو هەسـتیان بـە سـووکی کەژاوەکـە نـەکردبوو، پاشـان وشتـرەکەیان هەسـتاندبوو ڕۆیـشتبوون، منـیش ملوانکـەکـەم دۆزیـەوەو کاتێـک گەڕامـەوە کـەس لـەوێ نـەمابوو، لـە شـوێنەکەی خـۆم دانیـشتم دەمزانـی بـۆم دەگـەڕێن و دێنـەوە، ئـەنجا خـەو زۆری بـۆ هێنـام و خـەوم لێکـەوت، (صفوان)ی کـوڕی (الـمعطل الـسلمي) پێـشتـر لـە دوای سوپاکەوە سـەرخەوی شـکاندبوو، لـە کۆتـایی شـەودا کـەوتبووە ڕێ، دەمـەو بەیانی گەشتبووە شوێنەکەی مـن، تارمـایی زەلامێکـی خـەوتووی بینیبـوو هـات بـۆ لام و ناسـیمی، چـونکە پـێش فـەرزبوونی (حجاب) منـی بینیبـوو، منیش بە ( إنّا لله و إنّا إليه راجعون)ی (صفوان) خەبەرم بوویـەوەو کتـوپڕ بـە چـمکی چاوشـێوەکەم ڕووخـسارم داپۆشـی، بـەخوا نـە هـیچ قـسەیەکی لەگـەڵ کـردم و نـە هـیچ وشـەیەکم لـێ بیـست جگـە لـە ( إنّاالله و إنّـا إليـه راجعـون)، یەکـسەر وشتـرەکەی ئیخـداو منـیش سـواری بـووم، جڵـەوی وشتـرەکەی گرت و هێنـامی تاگەیشتینەوە بـە سـوپاکە، پـاش ئـەوەی لـەناو جەرگـەی نیـوەڕۆدا لەبـەر گـەرما لایـان دابـوو، ئـەوەی لـەم بوهتانـە منـدا قـسەی کـرد تیاچـوو، ئـەو کەسـەش کـە سـەرۆکایەتی بەشـێکی زۆری ئـەم تاوانەی کرد (عبدالله)ی کوڕی (أبيّ) کوڕی (سـلول)بـوو، کـاتێ هاتینـەوە بـۆ (مدینـة)، بۆمـاوەی مانگێـک نـەخۆش کـەوتم، لەولاشـەوە خـەڵکی ئـەم باسەیان ئەم بەروئەوبەر پێ دەکـردو، منـیش ئاگـام لـە هـیچ نـەبوو، بـەڵام لەوەدا کەوتبوومە گومانەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئـەو سۆزەی جـارانی بـۆم نـەمابوو کـە لـەکاتی نەخۆشـیما لێم دەبینـی، کاتێـک دەهاتــەوە سـەلامی دەکــردو دەیفــەرموو: (کَــيفَ تِيكُــمْ) ؟ واتــە

نەخۆشـەكەتان چـۆنە ؟ تـا شـەوێكيان لەگـەڵ دايكـى (مـسطح)دا چـووينە دەرەوە بۆ دەست بـەئاو گەيانـدن، لـەكاتى گەڕانەوەمانـدا دايكـى (مـسطح) پێى لەدامێنى كراسـەكەى هەڵكـەوتو وتى: چارەڕەش بى ئـەى (مـسطح)، منيش وتم: چەند خراپت وت، قـسە بـە كەسێك دەڵێى ئامادەى جەنگى (بـدر) بـووە، وتـى: ئـەى نەتبيـستووە چـى دەڵـێن بەتـۆ ؟ دەڵـێ: ئيتــر باسەكەى بۆ گێڕامەوەو ئەوەندەى تر نەخۆشكەوتم، گەڕامـەوە بـۆ ماڵـەوە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم هاتـە ژوورەوە بـۆلام سـەلامى كـردو فـەرمووى: (كَيْـفَ تِيكُــمْ) (نەخۆشـەكەتان چـۆنە؟) منـيش وتم: ڕێگـەم دەدەى بـچمەوە بـۆ لاى بــاوكو دايكــم ؟ دەمويـسـت لەڕێگـەى ئەوانــەوە دڵنيــابم لە هەواڵەكە، پێغەمبـەرى خـوا صلى الله عليـه وسـلم ڕێگـەى دام، هاتمـەوە بـۆ لاى دايـكو بـاوكم، بەدايكـم وت: دايـە خـەڵكى چـى دەڵێــن ؟ وتى: كچۆڵەكـەم گوێ مەدەرێ، بەخوا كـەم ڕێكەوتووە ژنێكـى جوانى وەك تـۆ لاى پياوێـك بێـتو خۆشـى بوێـتو سـەر بەهـەوێ بێـتو قـسەى زۆرى لەبـارەوە نەڵێن.

وتم: پـاكو بێگەردى بۆ خـوا خەڵكى چۆن ئەم قسەيەيان كردوە ؟ دەڵـێ: ئـەو شــەوە تــا بــەيانى گريــام فرمێـسك بەچـاومدا نەدەوەسـتايەوە بـۆ بەيـانيش هەر دەگريـام، پێغەمبـەرى خـوايش صلى الله عليـه وسـلم (علـي) كـوڕى (أبـو طـالب)و (أسـامة)ى كـوڕى (زيـد)ى بـانگ كـرد كاتێـك بـۆ نيگـا (وحـي) دواكـەوتبو ڕاوێـژى پيكـردن سـەبارەت بـە وازهێنـان لـە (عائـشـة)، (أسامة) ئامـاژەى بـۆ كردبـوو بـەوەى كـە دەيزانـى لـە پـاكيى خێزانـىو بـەو خۆشەويستيەش كە دەيزانى لەدڵيدا هەيە بەرامبەر بـە خێزانـى، وتبـووى: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم خێزانى خۆتەو ئێمەش لە چاكە بـەلاوە هيـچمان لێنـەديوە، (علـي) كـوڕى (أبـو طالـب)يـش وتبـووى: خـودا دونيـاى لێتـەنگ نـەكردوويتو خـۆ ژنـانى تـريش جگـە لـەو زۆرن، ئەگـەر

بشـچیته لای خزمەتکـارەکەی ڕاسـتیت پێدەڵـێت، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوایش صـلى الله علیـه وسـلم (بریـرة) بـانگ دەکـاتو دەفـەرموێت :(أیْ بَرِیـرَةُ هَـلْ رَأَیتِ مِنْ شَيْءٍ یَرِیبُـكِ مِنْ عَائِشَـةَ ؟).

ئەی (بریرة) هیچ شتێکت لـە (عائـشة) بینیـوە، کـە بتخاتـە گومانـەوە ؟ (بریرة)ش دەڵێت: سوێند بەو کەسەی تۆی بەڕاستی ناردووە هـیچ شـتێکی خـراپم لێنـەبینیوە ئەوەنـدە نـەبێت، کـە ئـەو کـچێکی منـداڵکاری تـازە پێگەیـشتووە، لـە ماڵـەوە بەسـەر هەویرەکەیـدا خـەوی لێدەکـەوێت، مـەڕو ماڵات دێت هەویرەکـەی دەخـوات.

پاشـان پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـه وسـلم چـووە سـەر مینبـەرو سـەبارەت بە (عبدالله)ی کوڕی (أبيّ) کوڕی (سلول) فەرمووی: {(یَـا مَعْـشَـرَ الْمُسْـلِمِینَ مَنْ یَعْـذِرُنِی مِـنْ رَجُـلٍ قَـدْ بَلَـغَ أَذَاهُ فِـي أَهْـلِ بَیْتِـی فَوَاللَّـهِ مَـا عَلِمْـتُ عَلَـى أَهْـلِي إِلاَّ خَیْـرًا وَلَقَـدْ ذَكَـرُوا رَجُلاً مَـا عَلِمْتُ عَلَیْـهِ إِلاَّ خَیْـرًا وَمَا كَانَ یَدْخُلُ عَلَى أَهْـلِي إِلاَّ مَعِي)} ، واتە: ئەی کۆمەڵگەی موسڵمانان، کـێ لۆمـەم دەکـات بـۆ سـزادانی پیاوێـك کـە ئەزیـەت و ئـازاری گەشـتۆتە خـاو خێزانیـشم؟ بـەخوا مـن لـەخاو خێزانـی خـۆم چـاکە نـەبێت هـیچ شـتێکی دیکـەیان لـەبارەوە نـازانم، نـاوی پیاوێکیـشیان بـردوە چـاکە نـەبێت هـیچ شتێکی تری لەبارەوە نازانم، لەگەڵ خۆما نەبێت نەهاتۆتە ماڵەوە).

(سعد)ی کوڕی (معـاذ)ی (الأنصاري) هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم ئەگەر لە (أوس) بوو ئێمە دەدەین لە گەردنی، ئەگەر لە برا (خزرجي)یەکانیشمانە چۆن فەرمانمان پێدەکەیت جێبەجێی دەکەین.

- (عائشة) دەڵێت: (سعد)ی کوڕی (عُبادة) کە سەرۆکی (خزرجي)یـەکان بـوو و پیـاوێکی بـاش بـوو، بـەڵام لـەو کاتـەدا دەمـارگیریی زاڵ دەبێـت بەسەریداو دەڵێ: سوێند بەخوا درۆ دەکەیت نایکوژیو ناشتوانیت بیکوژی.

(أسَيد)ی كوڕی (حُضَيْر)یش، كە ئامۆزای (سعد)ی كوڕی (مُعاذ)بوو هەستاو بە (سعد)ی كوڕی (عُبادة)ی وت: درۆ دەكەیت سوێند بە خوا دەیكوژین، تۆ دووڕویتو پاساو بۆ دووڕووەكان دێنیتەوە.

ئیتر هەردوو هۆزی (أوس) و (خزرج) تێهەڵچوون تا خەریك بوو دەست بدەنە یەكتریو بجەنگن، پێغەمبەری خوایش صلی الله علیه وسلم هەر لەسەر مینبەرەكەوە خەریك بوو بێدەنگی دەكردن، تا بێدەنگ بوونو خۆشی بێدەنگ بوو.

دەڵێ: ئەو ڕۆژەش هەر دەگریامو فرمێسك بە چاومدا نەدەوەستایەوە خەو نەچووە چاوم، پاشان بۆ شەوی داهاتووش هەر دەگریامو فرمێسك بەچاومدا نەدەوەستایەوەو خەو نەچووە چاوم، باوكو دایكیشم دەترسان گریان بمبڕێت، لەكاتێكدا ئەوان هەردووكیان لام دانیشتبوون، منیش هەر دەگریام ژنێكی (أنصاري) داوای مۆڵەتی لێكردم منیش مۆڵەتمدا، دانیشت دەستی كرد بە گریان، دەڵێت: لەكاتێكدا بەو حاڵەوە دانیشتبووین پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتە ژوورەوەو سەلامی كردو پاشان دانیشت، دەڵێ: لەو كاتەوە كە ئەوە دەربارەم وترابوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەلام دانەنیشتبوو، ماوەی مانگێك تێپەڕیبوو هیچی لەبارەی منەوە بۆ دانەبەزیبوو، دەڵێ: ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كاتێك دانیشت شایەتومانی هێناو فەرمووی: {(أمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبٍ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ)}، واتە: ئەی (عائشة) من لەبارەی تۆوە ئەوەو ئەوەم پێگەشتووە، جا ئەگەر تۆ بێتاوان بیت ئەوا خوای گەورە بێتاوانیت دەردەخات، خۆ ئەگەر تاوانێكیشت ئەنجام دابێت داوای لێخۆشبوون لە خوا بكەو تەوبە بكە،

چونکه بەندە ئەگەر کاتێ دانی نا بە تاوانێکدا پاشان تەوبەی کرد، خوا تەوبەکەی لێوەردەگرێت.

دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قسەکانی تەواوکرد، فرمێسکم وشکی کرد تاوەکو هەستم بە دڵۆپێك نەدەکرد، بە باوکم وت: لە جیاتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بدەرەوە، ئەویش وتی: بەخوا نازانم چی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڵێم، پاشان بە دایکم وت: لە جیاتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بدەرەوە، ئەویش وتی: بەخوا نازانم چی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڵێم، منیش وتم – لە کاتێکدا، کە من ئافرەتێکی منداڵکاریش بووم، قورئانیشم زۆر نەخوێندبوو - بە خوا من چاك دەزانم ئەمەی، کە بیستوتانە بە تەواوەتی لە دڵتانا جێگیر بووە باوەڕتان پێی کردووە، جا ئەگەر من پێشتان بڵێم: من پاکم – خوایش دەزانێ، کە من پاکم – باوەڕم پێناکەن، خۆ ئەگەر دانیش بە شتێکدا بنێم بۆتان- کە خوایش دەزانێ، کە من پاکم- باوەڕم پێدەکەن، بە خوا من هیچ نموونەیەکم دەست ناکەوێت بۆ خۆم و ئێوە ئەوە نەبێ، کە باوکی (یوسف) فەرمووی: (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَاتَصِفُونَ) دەڵێ: پاشان ڕووم وەرگێڕاو لەسەر جێگاکەی خۆم ڕاکشام، دەڵێ: بەخوا ئەو کاتە چاك دەمزانی، کە من بێتاوانم و، خوایش بە پاکی خۆم پاکیم دەردەخات، بەڵام باوەڕم نەدەکرد، کە خوا لەبارەمەوە (وحي) بنێرێت و بخوێنرێتەوە، خۆمم لا بچوکتربوو لەوەی، کە خوای گەورە لەبارەمەوە قسە بکات، بەڵام من تکام وابوو، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەوێك ببینێت، خوا بەهۆیەوە پاکیم دەربخات، بە خوا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە جێی خۆی نەجووڵاو کەسیش لە دانیشتوانی ماڵەکە دەرنەچوو بوون، تاوەکو خوا (وحي) نارد بۆ

پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم ئەو گەرماو ئازارەی، کە لەکاتی دابەزینی (وحي)دا دایدەگرت لەوێشدا دایگرت، تاوەکو بەڕادەیەك وەك وردە مرواری ئارەقی لێدەچۆڕا، لە ڕۆژی سەرماو سۆڵەی زستاندا، لەبەر قورسایی‌و سەختی ئەو ئایەتەی دادەبەزیە سەری ئارەقی دەکرد، دەڵێ: کاتێ (وحي) کۆتایی هات پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێکەنی، یەکەم وشە کە پێی هاتە گۆ ئەوە بوو، کە فەرمووی: {(أبشري يا عائشة أمّا الله فقد برّأك)}، واتە: مژدەت لێبێت ئەی (عائشة) خوا پاکێتی دەرخستیت.

دایکم پێی وتم: هەستە بچۆ بەدەمیەوە، منیش وتم: بەخوا ناچم بەدەمیەوە سوپاسی کەسیش ناکەم ئەو خوایە نەبێت، کە پاکێتی منی دەرخست، دەڵێ: خوای گەورە ئەم دە ئایەتەی بۆ پاکێتی من دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ

حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾﴾ النــور.

(عائــشــة) دەڵــێ: (أبــو بكــر) - كــە لــەوەو پــێش خــەرجی (مــسـطح)ی دەكێشـا لەبـەر خزمايـەتیو هەژاريەكـەی - وتـی: بـەخوا لەمـەولا هـەرگيز هيچ شتێكی پێنادەم پاش ئەوەی بوهتانی بۆ (عائشة) كرد، خوای گەورەش ئــەم ئايەتــەی نــارد: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ النور، واتـە: ئەوانـەی، كـە خـاوەنی سـامانو بەخـشندەيين لـە ئێـوە بـا سـوێند نـەخۆن، كـە يارمـەتی خزمـانو هەژارانو كۆچەران لەپێناوی خوادا نەدەن، با لێبوردەبنو چاوپۆشی بكەن، ئەی حەز ناكەن خوا لێتـان خـۆش بێت، خواش لێبوردەو ميهرەبانە.

(حِبّـان)ی كوڕی (مُوسَـى) دەڵـێ: (عَبْدالله) كوڕی (المُـبَارَك) دەڵێ: ئـەم ئايەتـە هيوا بەخشـتـرين ئايــەتە لە قورئاندا.

ئينجا (أبو بكر) وتـی: بـەخوا مـن حـەز دەكــەم خـوا لێـم خـۆش بێــت، بۆيە گەڕايەوە بۆ خەرجی كێشـانی (مـسطح)، كـە لـەوەو پـێش دەيكێشـاو وتی: هەرگيز لێـی ناگـرمەوە، (عائـشـة) دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليه وسلم پرسـياريشی لە (زينب)ی كچی (جحش)ی خێزانيـشی كردبـوو لە بارەمەوە:( مَا عَـلِمـتِ أوْ مَا رَأيـتِ ؟) هيچ دەزانی يا هيچـت بينيوە ؟

ئەويــش وتبـووی: ئــەی پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـە وسـلم زمـانو گوێم دەپـارێزم چاكـە نەبێت هيچ شتێكی تر نازانــم.

(عائشة) دەڵێ: لەناو خێزانەکانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم تەنها ئەو لە جوانیدا هاوشانی بوو، بەڵام بەهۆی خۆپارێزیو خواناسی خۆیەوە خوا پاراستی، بەڵام (حمنة)ی خوشکی بوختانەکەی بڵاودەکردەوە، - بۆ بەرزکردنەوەی پلەو پایەی خوشکەکەیو سووککردنی (عائشة) - تا تیاچوو لەگەڵ ئەوانەی کە تیاچوون.[١]

ئینجا ئەوانەی بەشداریان کردبوو لە هەڵبەستنی تۆمەتەکەدا، کە بریتی بوون لە: (مسطح) کوڕی (أثاثة)و (حسان)ی کوڕی (ثابت)و (حمنة)ی کچی (جحش)، یەکی هەشتا شەلاقیان لێدرا[٢].

## هەرکەس گومانی لە پاکی (عائشة) خوای لێ ڕازی بێت هەبێت بە (کافر)و هەڵگەڕاوە دادەنرێ !

پێشەوا (ابن کثیر) دەڵێت: (وقد أجمع العلماء رحمهم الله قاطبةً على أن من سبها بعد هذا ورماها بما رماها به بعد هذا الذي ذكر في هذه الآية، فإنه كافر لأنه معاند للقرآن، وفي بقية أمهات المؤمنين قولان: أصحهما أنهنّ كهي، والله أعلم...)[٣]، واتە: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، کە هەر کەسێك داوێن پیسی بداتە پاڵ (عائشة) دوای ئەوەی ئایەتی لەسەر دابەزیوە ئەوا (کافر) دەبێت، چونکە نکوڵی لە ئایەتی قورئان دەکات، سەبارەت بە خێزانەکانی تری دوو ڕا هەیە ڕاستترینیان ئەوەیە، کە ئەوانیش وەك (عائشة) وان خوایان لێ ڕازی بێت، خوایش زاناترە.

---

١) رواه البخاري: (٢٦٦١)، ومسلم: ( ٧١٩٦)، واللفظ له.

٢) بڕوانە : تفسير القرطبي: (١٢ / ٢٠١).

٣) تفسير ابن كثير: (٣/ ٣٣٧) .

هـه‌روه‌ها (القـاضي أبُو يَعْـلى الحَنْبَلِي) ده‌ڵێـت: {مَـنْ قَـذَفَ عَائِشَـةَ بِمَـا بَرَّأَهَـا اللهُ مِنْهُ كَـفَرَ بِلا خِلافٍ، وقَـدْ حَكَى الإجْمَاع على هَـذَا غَيْـرُ وَاحِدٍ، وصَـرَّحَ غَيْـرُ واحِـدٍ مِـنَ الأئِمَّـةِ بِهَـذا الحُكْـم}[1]، واتـه: هـه‌ر كه‌سـێك (عائشة) تۆمه‌تباربكا دوای ئه‌وه‌ی خوای گه‌وره پـاكێتی سه‌لـماندووه ئـه‌وا بـه‌بێ جیـاوازی ڕای زانایـان (كـافر) ده‌بێـت، چـه‌ندین زانـاش یه‌كـده‌نگیان له‌سه‌ر ئه‌وه باسـكردووه كه (كافر) ده‌بێت.

پێـشه‌وا: (قـرطبـي)یـش ده‌ڵێـت:{فكـل مـن سـبها بمـا برأهـا الله منـه مكـذب لله، ومن كـذب الله فهـو كـافر}[2]، واته: هه‌ر كه‌سێك داوێـن پیسی بداته پاڵ (عائشة) پاش ئه‌وه‌ی، كه خوای گه‌وره پاكێتی سه‌لماندووه، ئـه‌وه خوای به‌درۆ زانیوه، كه‌سێكیش خوا به‌درۆ بخاته‌وه ئه‌وه بێگومان كافره.

١٤- زانست فراوانی دایكه (عائشـة) خـوای لـێ ڕازی بێـت: {عـن أبـي موسـى قـال: مـا أشكل علينـا أصحاب رسـول الله صلى الله عليـه وسلم حـديث قـط فسـألنا عائشـة إلا وجدنا عندهـا منـه علمـا}[3]، واتـه: ئێمـه‌ی هـاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليـه وسـلم هـه‌ر فه‌رمووده‌یـه‌كمان بـه‌لاوه ڕوون نه‌بووبێت، پرسـیارمان لـه (عائشـة) كردبێـت، ئـه‌وا وه‌ڵامه‌كـه‌یمان لــه‌لای ئه‌و ده‌ست ئه‌كه‌وت.

- قـال مـسـلم: {سـألنا مـسـروقا كانـت عائشـة تحـسـن الفـرائض؟ قـال والذي لا إله غيـره لقد رأيت الأكابر من أصحاب محمـد صلى الله عليـه وسلم يسألونها عن الفرائض}[4]، (مسلم) ده‌ڵێت: پرسـیارمان كـرد لـه (مـسروق):

١) الصارم المسلول: (١/ ٥٦٨) .
٢) تفسيـر القرطبي: (١٢/ ٢٠٦) .
٣) صحيح سنن الترمذي: (٣٨٨٣) .
٤) سنن الدارمي، رقم (٢٨٥٩)، وقال محققـه: إسناده صحيح.

ئایا عائشة له زانستی میـرات دابەشكردنـدا شارەزایی هەبووی وتی: بەو خوایەی جگە لەو كەس شایستەی پەرستن نیە گەورە هاوەڵانی (محمـد)م صلی الله علیە وسلم بینیوە لەبارەی میـراتەوە پرسیاریان لە (عائشـة) كردووە.

- (موسـی)ی كـوڕی (طلـحة) دەڵـێت: {مـا رأیـت أحـداً أفـصح مـن عائشـة}[1]، كەسم نەبینیوە لە (عائشة) زوبـان پاراوتر بێت.

- (عـروة) دەڵـێـت: {مـا رأیـت أحـداً أعلـم بفقـه ولا بطـب ولا بـشعر مـن عائشـة}[2]، واتە: كەسم نەبینیوە لە (فقـە)و پزیشكیو شیعردا زاناتـر بێت لە (عائشـة).

- (الزهري) دەڵێت:{لو جمع علم عائشة إلی علم جمیع أمهات الـمؤمنین وعلـم جمیـع النـساء لكـان علـم عائـشة أفضـل}[3]، واتـە: ئەگـەر زانـستی (عائـشة) بـەراورد بكرێـت لەگـەڵ زانـستی هـەموو دایكـانی ئیمانداراندـاو، هەروەها لەگەڵ هەموو زانستی ئافرەتاندا ئەوا زانستی (عائشة) چاكتـرە.

- (عطـاء)ی كـوڕی (ربـاح) دەڵـێت: {كانـت عائـشة أفقـه النـاس وأعلـم النـاس وأحسـن النـاس رأیـاً فـي العـامة}[4]، واتە: (عائشـة) شەرعزانتـرینو زاناترینو چاكتـرین كەس بوو لە ڕاوبۆچووندا لەناو خەڵكیدا بەگشـتی.

- (عـروة) بە (عائشـة)ی وت: دایە گیان مـن سەرسـام نـیم بـە زانـستت، ئـەڵێم خێزانـی پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـە وسـلم و كـچی (أبـوبكر)ە، سەرسامیش نـیم لـە شـارەزاییت لـە شیعرو مێـژووی عـەرەب، ئـەڵێم كـچی

---

١) صحیح سنن التـرمذي: (٣٨٨٤).
٢) الإصـابة: (١٨/٨) .
٣) الاسـتیعاب: (١٩٢/٢) .
٤) هەمان سـەرچاوە: (١٠٩/٢) .

(أبـوبکر)ە کـە شـارەزاترین کـەس بـووە لـەو بـوارەدا، بـەڵام سەرسـامم لـە شارەزاییت لە زانستی پزیشکیدا، ئەمە چۆنەو لە کوێت هێنـاوە ؟!

(عروة) دەڵێت: دەستێکی لە شـانـمداو وتی: أيْ عُرَيَّةُ إنَّ رَسُول اللّهِ صلى الله عليـه وسـلم كَـانَ يَسْـقَمُ عِنْـدَ آخِرِ عُمُـرِهِ أوْ فِـي آخِـرِ عُمُــرِهِ فَكَانَـتْ تَقْدَمُ عَلَيْـهِ وُفُـودُ الْعَـرَبِ مِنْ كُلِّ وَجْـهٍ فَتَنْعَـتُ لَهُ الْأنْعَـاتَ وَكُنْـتُ أُعَالِجُهَـا لَهُ فَمِنْ ثَمَّ[1]، واتە: ئەی (عُرَيَّة)[2] پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسـلم لەکۆتـایی تەمـەنی نـەخۆش کـەوت، نوێنـەری عەرەبـەکان لـە هـەموو لایەکـەوە دەهاتنـە لای چارەسـەریان بـۆ دیـاری دەکـردو منـیش بـۆم بەکاردەهێنـا، لەوێـوە فێربووم.

## ڕاستکردنەوەکانو شـارەزایی خاتوو (عائشــة) ڕەزای خوای لێبێ

### یەکەم: ڕاستکردنەوەی خاتوو عائیشـە بۆ هاوەڵان:

١- ڕاستکردنەوەی بۆ (عبد الله)ی کوڕی (عبـاس).

٢- (عمرة)ی کچی (عبـدالرحمن) دەڵێ: (زیـاد)ی کـوڕی (أبـو سفیان) نامـەی نوسـی بـۆ (عائیـشة) کـە(عبـدالله)ی کـوڕی (عبـاس) وتویـەتی: ئـەوەی قوربانییەك بڕیار بدات، چی لەسەر حاجی حەڕامـە بـۆ ئـەویش حەڕامـە هـەتا قوربانیەکـەی بـۆ سـەر دەبڕدرێـت، جـا منـیش قوربـانیم نـاردووە، وەڵامم بدەرەوە.

(عمرة) دەڵێ: (عائیشـە) وتی: بەو شێوەیە نیە کە (إبـن عبـاس) دەڵێ، من خۆم ملوانکەی قوربانییـەکانی پێغەمبەری خوام صلى الله عليـه وسـلم

---

١) رواه أحمـد فـي مسـنده وصححه شعيب الأرناؤوط فـي تعليقه عليه برقم: (٢٤٤٢٥).

٢) (عُرَيَّـة) بچوککراوەی (عروة)يە.

هۆنیەوەو پاشان پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەدەستی خۆی کردیە ملیانو لەگەڵ باوکمدا هەموویانی نارد، کەچی هیچ شتێك لەوانەی بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم حەڵاڵ بوو، خوای گەورە لەسەری حەرام نەکرد[١].

٣- ڕاستکردنەوەی بۆ (عبد الله)ی کوڕی (عمر)دا: (مجاهد) دەڵێ: منو (عروة)ی کوڕی (زبیر) چووینە مزگەتەوە، (ابن عمر) نزیك حوجرەکەی (عائیشە) دانیشتبوو، (عروة) پێی وت: باوکی عبدالرحمن پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چەند عومرەی کردووە؟

وتی: چوار عومرەی کردووە یەکێکیان لە مانگی (رجب)دا بوو، ئێمەش پێمان خۆش نەبوو بۆی ڕاستکەینەوەو وەڵامی بدەینەوە، گوێمان لە سیواککردنی (عائیشە) بوو لە حوجرەکەیدا، (عروة) وتی: دایکی ئیمانداران گوێت لێیە باوکی عبدالرحمن دەڵێ چی ؟!

وتی: دەڵێ چی ؟

دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چوار عومرەی کردووە یەکێکیان لە مانگی (رجب)دا بووە.

وتی: خوا لە باوکی عبدالرحمن خۆش بێت لە هەموو عومرەکاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بووەو هەرگیز لە (رجب)دا عومرەی نەکردووە[٢].

- عن نافِع قالَ: قِيلَ لابن عُمَر: إن أبَا هُرَيرَةَ يَقُولُ: سَمِعت رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: من تبع جَنَازَة فله قيراط مِنَ الأجرِ فَقَالَ ابنُ عُمَرَ: أكثرَ عَلَينَا أبُو هُرَيرَةَ فبَعَثَ إلى عائشةَ فسَألَهَا فصَدَّقت أبَا

---

١) أخرجه البخاري: (١٥٨٥)، ومسلم: (٢٣٤٠).
٢) رواه مسلم: (٢٢٠٠) .

هُرَيْرَةَ فقَالَ ابنُ عُمَرَ: لَقَدْ فرَّطنا فِي قرَارِيطَ كَثِيرَةٍ[١]، واتە: نافع دەڵێ: بە (إبن عمر) وترا: (أبو هريرة) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە کە دەیفەرموو: ئەوەی شوێنی جەنازەیەك بکەوێ قیراتێك (قورسایی کێوێك) چاکەی دەست دەکەوێت. (إبن عمر)یش دەڵێ: (أبو هريرة) لێی تێکچووە، ئەنجا ناردی بۆ لای (عائیشە)و پرسیاری لێکرد، ئەویش گێڕانەوەکەی (أبوهريرة)ی پشتڕاست کردەوە، (إبن عمريش) وتی: بەڕاستی قیراتی زۆرمان بەزایە داوە.

هەروەها دەڵێ: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی مانگ (٢٩) ڕۆژە، بۆ (عائشة) یان گێڕایەوە، ئەویش وتی: خوا لە باوکی عبدالرحمن خۆش بێ کاتێك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆماوەی مانگێك لە خێزانەکانی دوورکەوتەوەو دوای بیستو نۆ ڕۆژ هاتەوە بۆ لایان، هاوەڵانیش ئەوەیان پێوت، فەرمووی: (ان الشهر قد يكون تسعاً وعشرين) جاری وا هەیە مانگ بیستو نۆ ڕۆژە[٢].

٤- ڕاستکردنەوەی بۆ (عَبْد الله)ی کوڕی (عمرو):- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ بَلَغَ عَائِشَةَ أنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو يَأمُرُ النِّسَاءَ إذَا اغْتَسَلْنَ أن يَنْقُضْنَ رُءُوسَهُنَّ فقَالَتْ يَا عَجَبًا لابْنِ عَمْرٍو هذَا يَأمُرُ النِّسَاءَ إذَا اغْتَسَلْنَ أن يَنْقُضْنَ رُءُوسَهُنَّ أفلا يَأمُرُهُنَّ أنْ يَحْلِقْنَ رُءُوسَهُنَّ لَقَدْ كُنْتُ أغْتَسِلُ أنَا وَرَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم مِنْ إنَاءٍ وَاحِدٍ وَلا أزِيدُ عَلَى أن أفْرِغَ عَلَى رَأسِي ثَلاثَ إفْرَاغَاتٍ[٣]، هەواڵ گەیشت بە (عائیشە)، کە

---

١) رواه البخاري: (١٣٣٩)، ومسلم: (١٥٧٣).
٢) رواه أحمد: (٥١٨٢) وصححه الأرناؤوط.
٣) رواه مسلم: (٤٩٨).

(عبـدالله)ی کـوڕی (عمـرو) فەرمانیـداوە بـە ژنـان لـە کـاتی خۆشـۆردندا کـەزی قژیان بکەنەوە، ئەویش دەڵـێ: سـەرم سوڕماوە لـەم (إبـن عمـرو)ە فەرمان دەکات بە ژنان لەکاتی خۆشۆردندا کەزیـەکانیان قـژیان بکەنـەوە ئـەی بـۆ فـەرمانیان پێناکـات سـەریان بتاشـن (چـونکە ئەگـەر کردنـەوەی پرچی قژ (واجب) بێـت تاشینیـشی (واجب) دەبێـت بـۆ نەهێـشتنی ئـەو زەحمەتە) بەڕاسـتی مـنو پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم لەیـەك دەفردا خۆمان دەشـوشـت، جگـە لـە سـێ جـار ئـاوکردن بەسـەرمدا هیـچی ترم نەدەکرد.

٥- شـارەزایی بەسەر (أبو هُرَیْرَة)دا:- (أبو هريرة) دەیـوت: (من أدركه الفَجـر جنبا فلا يصم)، واتە: هەرکەسێك بە لەشی گرانەوە ڕۆژی کردەوەو پـێش بانگی بەیانی خۆی نەشوشت با بەڕۆژوو نەبێ، واتە ڕۆژووەکەی بەتاڵە.

بۆیە دوو کەس دەچن بۆ لای (عائیشە)و (أمِّ سـلمة) پرسیاریان لێکردن، (عائیشە) وتی: {كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم يصبح جنبا من غَيْر طهر ثمَّ يَصُوْم}، واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە لەشگرانی یەوە ڕۆژی لـێ ئەبوویەوەو پاشـان بە ڕۆژووش ئـەبوو.

کە هەواڵەکـە بە (أبو هُرَیْرَة) درا وتی: ئـەوان وایـان وت ؟ وتـی: بەڵـێ. وتی: دەی ئەوان زاناترن، من ئەو قسـەیەم لە پێغەمبـەری خواوە صلى الله عليه وسلم نەبیستبوو، بەڵکو لە (فضـل)ی کوڕی (عباس)ەوە بیستبووم. دەڵـێ: ئیتـر لەو وتـەیەی وازی هێنـا[1].

٦- ڕاسـتکردنەوەی بـۆ (مـروان)ی کـوڕی (الحکـم):- (محمـد)ی کـوڕی (زیـاد) دەڵێ: کاتێك (معاویـة) بەیعەتیـدا بـە (یزیـد)ی کـوڕی، (مـروان)ی کـوڕی (حکـم)ی والـی (مدینـة)، وتـی: سـوننەتی (أبـو بکـر) و(عمـر)ە،

---

١) رواه مسـلم: (١٨٦٤) .

(عبدالرحمـــن)ی كــوڕی (أبوبكــر)یــش، وتــی: ســـوننەتی (هرقــل) و (قیصــر)ە ! (مروان)یش وتی: خەڵكینە ئایــەتی (والـذي قـال لوالديـه أفٍ لكما ...) لەسەر ئەم دابەزیوە.

كاتێك ئەم قسەیە گەشـتەوە بە (عائیشـە) وتی: كـذب والله ! ما هـو بـه، ولو شئت أن أسمي الذي أنزلت فيه لسمّيته، ولكن رسول الله صلى الله عليـه وسلم لعـن أبا مروان، ومروان فـي صلبه، فمروان فُضَضٌ من لعـنة الله[1]، واتە: سوێند بەخوا درۆ دەكات، ئەگەر بتەوێ نـاوی ئـەو كەسـە دێـنم، كـە ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزی، بەڵام پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليـه وسـلم نـەفرەتی لـە بـاوكی (مـروان) كـردووە كاتێـك (مـروان) لـە پـشتیدا بـووە، كەواتە (مروان) بەشێكە لە نەفرەتی خوا.

٧- ڕاسـتكردنەوە بـۆ (أبـو موســی)ی (الأشـعري):- (أبـو عطيـة) دەڵێ: مـن و (مــسروق) چـوین بـۆ لای (عائـشە)و (مــسروق) پێـی وت: دوو پیــاو لــە هــاوەڵانی محمــد صــلى الله عليــه وســلم یــەكێكیان پەلــەدەكات لــەكاتی خۆرئـاوابوون و ڕۆژووشـكانداو ئـەوی تریـشیان درەنـگ ڕۆژو دەشـكێنێت و درەنگیش نوێژەكەی دەكـات.

(عائیـــشە)ش وتـــی: كامیـــان پەلـــەدەكات لـــەكاتی خۆرئـــاوابوون و ڕۆژووشكاندا ؟

وتمـان: (عبداللە)ی كوڕی (مسعود)، ئەویش وتی: پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم هـەر وایـدەكرد، ڕاوی فەرموودەكــە دەڵــێت: ئــەوی تریـشیان (أبو موسی)ی (الأشعري) بوو[2].

---

١) السلسـلة الصـحيحة: (٤٣/١٣) .
٢) رواه مسـلم: (١٨٣٩) .

٨- شـارەزايى بەسـەر (عُـرْوَة)ى كـوڕى (الزُّبَيْـر)دا :- (عـروة) دەڵـێ: بـە (عائيـشە)م وت: مـن وانـازانم گونـاهم بگـات ئەگـەر هاتووچـۆى نێـوان (صفا)و (مروة) نەكەم، ئەويش وتى: بۆچى؟

وتم: چـونكە خـواى گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ ... ﴿١٥٨﴾﴾ البقـرة، واتە: بەڕاستى هـاتووچۆى نێـوان (صـفا)و (مروة) لە دروشـمەكانى (خوا)ن، هەركەسێك چوو بۆ حەجى ماڵى خوا، يان هەر بـۆ بەجێهێنـانى عـومرە، هـيچ گونـاهێكى ناگـات گـەر هاتووچـۆى نێـوان هـەردوو تەپۆڵـەى (صفا)و (مـروة) بكـا.

(عائيشـە)ش وتى: ئەگەر وابوايە، كە تۆ دەيڵێى، ئايەتەكە بەم شـێوەيە دەبوو: (فلا جُنَـاحَ عَلَيْـهِ أن لا يَطوَّفَ بِهِمَا)، واتـە: ( ئـەوا گونـاهى ناگـات ئەگەر هاتووچۆى نێوانيان نەكات). لەڕاستيدا ئەوە دەربارەى كەسانێك لە پشتيوانان (أنصـار) دابەزيوە، كە دەنگيان بۆ (مناة) بەرز دەكردەوە، ئيتـر بۆيان نەبوو هاتـووچۆى نێوان (صفا)و (مـروە) بكـەن، جا كاتێـك لەگـەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم هاتن بـۆ حـەجو باسـى ئـەوەيان بـۆ كـرد، خواى گەورە ئەو ئايەتەى دابەزاند، بەڕاستى خوا حەجى كەسێك بەتەواو دانانێت ئەگەر هاتووچـۆى نێـوان (صـفا)و (مـروة)ى ئـەنجام نـەدابێت، لـە ريوايەتێكى تردا: خوا حـەجى كەسـێك يـان عومرەكـەى بەتـەواو دانانێـت ئەگەر هاتووچۆى نێوان (صـفا)و (مروة) ئەنجام نەدابێت[1].

٩- شارەزايى بەسەر خێزانەكانى پێغەمبـەردا صـلى الله عليـە وسـلم:- كاتێـك پێغەمبەرى خوا صـلى الله عليـە وسـلم كۆچـى دوايـى دەكـات خێزانـەكانى دەيانـويـست (عُثمَـان)ى كـوڕى (عـفّان) بنێـرن بـۆ لاى (أبـوبكر) داواى

---

١) أخرَجَه البُخَارِيُّ: (١٦٤٣)، ومُسلِمٌ: (٢٢٤١) واللفظ لهُ.

میــراتی لێبکـەن، (عائیـشـە) پێیـان دەڵـێت: بەڕاسـتی پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: {لا نورث ما ترکنـاه صـدقة}[1]، واتە: کەس میـرات لە ئێمە نابات ئەوەی بەجێی دێڵین (صـدقة)یە.

دووەم: شــارەزاییە گشــتیەکانی خاتوو عائیشــە:-

١- شــارەزایی بـۆ نوێـژی مـردوو لـە مزگەوتـدا: - (عائیـشـە) دەڵـێ: کاتـێ (سعد)ی کـوڕی (أبـو وقـاص) کۆچـی دوایـی کـرد، خێزانـەکانی پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم هـەواڵیان نارد کە حەز دەکەن سـەردانی جەنازەکەی بکەن و نوێژی لەسەر بکەن، ئەوانیش ڕێیان پێـدان و جەنازەکە لەبـەردەم ژوورەکانیانــدا وەســتێنراو نوێــژیان لەســەر کــرد، پاشــان لــە دەرگــای مزگەوتـەوە جەنازەکـەیان بـردە دەرەوە، خەڵکەکـەش ئـەوەیان پـێ بـاش نەبوو، وتیان: جاران بەو جۆرە تەرم نەدەبرایـە ناو مزگـەوت.

ئـەم هـەواڵە گەیـشتە (عائیـشە)، بۆیـە وتـی: چـەند پەلـە دەکـەن لـە ڕەخنە گرتن لە شتێکدا کە زانیارییان لەبارەیەوە نیە، ڕەخنەیان لێگرتین تەرمێك براوەتە مزگەوتـەوە، لەکاتێکدا پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـە وسلم لەناو مزگەوتدا نوێژی کرد لەسەر (سهیل)ی کوڕی (بیضاء)[2].

٢- شــارەزایی ســەبارەت بــە جێنــشینـکردنی (علــي) خــوای لــێ ڕازی بــێ:- (أسـوَد)ی کـوڕی (یَزیـد) دەڵـێ: لـەلای (عائــشـة)دا وتیــان: (علـــي) شـوێنگـری پێغەمبـەرە صـلی الله علیـە وسـلم (وەسـیەتی بـۆ کـردووە) ئەویش وتی: چ کـات وەسیەتی بۆ کـرد؟ لەکاتێـدا سـەری پیـرۆزی لەسـەر چۆکی مندابوو کۆچی دوایی کرد، ئیتـر کەی وەسیەتی بۆ کرد ؟![3]

---

١) رواه البخاري: (٦٧٣٠) مُسلِم: ( ٤٦٧٨) .
٢) رواه مسلم: (١٦١٦) .
٣) رواه البخـاري: (٢٥٣٦)، ومسـلم: (٣٠٨٨).

٣- شارەزایی سەبارەت بەشەونوێژی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم:- (أبو سَلمَة)ی كوڕی (عَبْد الرَّحمَن) دەڵێ: لە (عائیشە)م پرسی: نوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ڕەمەزاندا چۆن بوو؟

ئەویش وتی: مَا كَانَ يَزِيد فِيْ رَمَضَانَ وَلا فِيْ غَيْره عَلَى إِحْدَى عَشْرَة رَكْعَة[1]، واتە: لە ڕەمەزانو غەیری ڕەمەزانیشدا زیاتر لە یازدە ڕكاتی نەدەكرد.

٤- شارەزایی سەبارەت بەوەی، كە خۆشۆردن پێویست دەكات:- (أبو مُوسَى الأشعري) دەڵێ: كۆمەڵێك لە كۆچەرەكانو پشتیوانان جیاوازی كەوتە نێوانیان، پشتیوانەكان وتیان: خۆشۆردن پێویست نابێت تاوەكو ئاو نەیەتەوە، كۆچەرەكانیش وتیان: بەڵكو بە تێكەڵبوون خۆشۆردن پێویست دەبێت، دەڵێ: منیش وتم من ئەمەتان بۆ چارەسەر دەكەم، هەستامو چووم بۆ لای (عائیشە)و مۆڵەتم لێوەرگرت ئەویش مۆڵەتی دامو پێم وت: دایە گیان من دەمەوێت لەبارەی شتێكەوە پرسیارت لێبكەم بەڵام شەرمت لێدەكەم، ئەویش وتی: شەرم مەكە ئەو پرسیارەی پرسیوتە لەو دایكەت كە تۆی لێبوویت لەمنیشی بپرسە منیش دایكتم، وتم: چی خۆشۆردن پێویست (واجب) دەكات ؟

وتی: بۆلای كەسێكی شارەزا هاتی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: {إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ وَمَسَّ الخِتَانُ الخِتَانَ فَقَدْ وَجَبَ الغُسْلُ}[2]، واتە: ئەگەر لەنێوان هەردوو قاچو ڕانیدا دانیشتو خەتەنەكراوی ئەم بەر خەتەنەكراوی ئەو كەوت خۆشۆردن پێویست دەبێت.

---

١) البخاري: (١٨٧٤)، ومسلم: (١٢١٩) .

٢) رواه مسلم: ٥٢٦ .

**دەرچوونی دایکـە (عائیشـە) لە ڕۆژی (جمـل)دا بۆ ئاشـتەوایی بوو**

پـێش شـەهیدکردنی پێـشەوا (عثمـان) خـوای لـێ ڕازیبـێ لـە (مدینـة)، (عائیـشە)و هـەموو خێزانـەکانی تـری پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم لەبـەر خراپی بارودۆخی شاری (مدینة) بەرەو (مکـة) بەڕێدەکـەون بـۆ ئەنجامـدانی فـەریزەی حـەج، دوای ئەنجامـدانی فەریزەکـەو لەکـاتی گەڕانەوەیـاندا بـۆ (مدینـة) هەواڵی شـەهیدکردنی پێـشەوا (عثمـان)یـان پێـدەگات، بۆیـە بڕیـاری گەڕانەوە بۆ (مکة) ئـەدەن و لـەوێ دەمێننـەوەو چاوەڕوانـی دەکەن، تـا بـزانن چی ڕووئەدات؟

کاتێـك خیلافـەت دەدرێتـە دەسـتی پێـشەوا (عەلـی) خـوای لـێ ڕازی بـێ، ئـەویش لەناچاریدا وەریدەگرێـتو، سـەرنج ئـەدا، کـە ئاژاوەچییەکان بەسـەر شاری مەدینەدا زاڵ بوون و تەنگیان بە دانیشتوانەکەی هەڵچنیوە، لەبەرئـەوە وای پێباشـە، کـە تۆڵەسـەندنەوەی پێـشـەوا (عثمـان) خـوای لـێ ڕازی بـێ دوا بخات بۆ کاتێکی گونجـاو ...

(طلحـة و زبیـر)یـش خوایـان لـێ ڕازیبـێ بـارودۆخی (مدینـة)یـان پێبـاش نابێـت، بۆیـە مۆڵـەت لـە خلیفـة دەخـوازن بـۆ ئەنجامـدانی (عـُمرة)، ئـەویش مۆڵـەتیان دەداو، خـەڵکێکی زۆریـش شـوێنیان دەکـەوێت، کـە دەگەنـە (مکـة) ڕایـان لەگـەڵ ڕای دایکـە (عائـشـة) یـەك دەگرێـتو داوای کوشـتنی بکـوژانی خلیفـة (عثمـان) دەکـەنو، بـەرەو شـاری (بـصرة و کوفـة) بەڕێدەکـەون - کـە دانیـشتوانەکەی لایـەنگری (طلحـة و زبیـر) بـوون- تـا لـەوێ سـوپایەك کۆبکەنەوەو (مدینة) لەو ئاژاوەچییانە ڕزگار بکەن .

بەڵام خێزانەکانی تری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕایان وایە بگەڕێنـەوە بۆ (مدینة)، جگە لە (حفصة)، کە هاوڕایە لەگەڵ (عائشة)دا، بەڵام (عبدالله)ی برای ڕێگەی پێنادات سەفەر بکات بۆ هیچ شوێنێك جگە لە (مدینـة)، کاتێـك

خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەیر دەکەن کەسیان لەگەڵ نیە بڕیار ئەدەن لە (مکة) بمێننەوە، (عائشة)و (طلحة)و (زبیر)یش خوایان لێ ڕازی بێ بە (٣٠٠) سوارچاکەوە بەرەو شاری (بصرة) بەڕێدەکەون، خێزانەکانی پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم تا ناوچەی (ذات عرق) لەگەڵیان دەڕۆن، لەوێ بە گریانێکی بەکوڵەوە خواحافیزی لە (عائشة) دەکەن، هەموو ئەوانەی کە لەوێن دەست بەگریان دەکەن، بۆیە ئەو ڕۆژە بە ڕۆژی گریان (یوم النحیب) ناسراوە.

کاتێك گەشتنە ئاوی (بني عامر) شەوبوو سەگەکان لێیان وەڕین، (عائشة)ش وتی: أي ماء هذا ؟ (واتە: ئەم ئاوە چ ئاوێکە) ؟

وتیان: ماء الحوأب. ئاوی (حوأب)ە.

وتی: ما أظنني إلا أنني راجعة، (واتە: دەبێ بگەڕێمەوە).

هەندێ لەوانەی لەگەڵیدا بوون وتیان: بل تقدمین فیراك المسلمون، فیصلح الله ذات بینهم، واتە: باشتروایە بچیت تا موسڵمانان بتبینن، بەڵکو خوای گەورە ئاشتەوایی بخاتە نێوانیان.

عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕۆژێك فەرمووی: {کیف بإحداكن تنبح علیها كلاب الحوأب}[1]، واتە: چۆنە حاڵی یەکێك لە ئێوە (واتە: خێزانەکانی) کاتێك سەگەکانی (حوأب) لێی دەوەڕن !

لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: {أيَّتكُنَّ صَاحِبَة الجَمَل الأدبَب تخرُج حَتَّى تَنبَحهَا كِلاب الحَوْأب يُقتَل عَن يَمِينهَا وَعَن شِمَالهَا قتلَى كَثِيرَة وَتَنجُو مِن بَعد مَا كَادَت}[2]، واتە: کامەتانن

---

١) رواه ابن حبان (٦٧٣٢)، وأحمد (٢٤٢٩٩)، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة: (٤٧٤)، و شعيب الأرناؤوط: (٦/ ٥٢ )، برقم: (٢٤٢٩٩، ٢٤٦٩٨).

٢) قال ابن حجر، في فتح الباري: (٢٠/١٠٧): وَهذَا رَوَاهُ البَزَّار وَرِجَاله ثِقَات.

خاوەنی وشتـــرە توکنەکـەن؟ دەڕوات کاتێـك سـەگەکانی (الحَوأب) لێـی دوەڕن، بەلای ڕاستو چەپیدا کەسانێکی زۆر دەکوژرێنو، ڕزگاری دەبێت پاش ئـەوەی خەریك بوو لەناو بچێت.

خوێنەری بەڕێز:

کەواتــە ڕوونو ئاشـکرایە کـە دایکـە (عائـشة) و (طلحـة و زبیـــر) بــۆ ئاشتەوایی نێوان موسڵمانانو تۆڵەسەندنەوە لە بکوژان بەرەو (بصرة و کوفة) بەڕێدەکـەون، کۆمـەڵی ئەمبـەریش کـە پێـشەوا (علـي) سـەرکردایەتی دەکـرد، وەنـەبێ خـوێنی (عثمـان)ی لـەیاد کردبێـت، بەڵـکو زیـاتر لـەوان خەمــخۆری خەلیفەی شەهید بـوو، بـەلام قووڵتــر لـەوان بیــری دەکـردەوەو، دەیویـست بـە حیکمەت ئەم کـارە ئەنجام بـدات، بۆیـە لـە (مدینـة)وە بـە ڕێدەکـەوێت تـاوەکو بیانگێڕێتەوە، بەلام بەداخەوە ئەوەی کـە هـەردوولایان نەیاندەویـستو کاریـان بۆنـەکردبوو ڕوویـداو، هـەر ئەوانـەی (عثمـان)یـان شـەهید کردبـوو شـەڕیان بـەرپاکرد، ئیتــر بارودۆخـە لـەژێر کۆنتــڕۆڵی هاوەلانـدا نـەماو شـەڕ دەسـت پێـدەکات، پـەلاماری وشتــرەکەی (عائیـشە) دەدەنو لایــەنگرانی بەرگریــەکی مەردانـەی لێدەکـەنو کوشـتارو برینـدارێکی زۆری لێدەکەوێتـەوە، بەڵێنەکـەی پێغەمبەری خۆشەویستیش صلی الله علیه وسلم دێتـەدی[١]!!

دوای شەڕەکە پێشەوا (علي) هاتـە لای (عائـشـة)و پێـی وت: (غفـر الله لـك. قالـت: ولــك، مـا أردت إلا الإصلاح)[٢]، واتـە: خـوا لێـت خۆشـبێت، (عائـشة)ش وتی: خوا لە تۆش خۆشبێت، ئاشـتەوایی نەبێت هیچی دیکەم نەویسـت.

ئینجـا پێــشەوا (علـي) دایکــە (عائــشة) دەنێرێتــە ماڵێــك لــە ماڵــەکانی (بــصرة)و ڕێــزو حورمــەتی لێــدەگرێو، پاشــان ئــەوەی پێویــست بــوو بــۆ

---

١) بڕوانە: البدایة والنهایة: (٧/ ٢٣١) .

٢) شذرات الذهب لابن العماد: (١/ ٣٦) .

سەفەرەكەی بۆی ئامادە دەكات، (٢٠ یا ٤٠) لە ئافرەتە ناودارەكانی (بصرة) لەگەڵیدا دەنێرێت و لەگەڵ (محمد)ی برایدا دەینێرێتەوە بۆ ماڵەكەی خۆی بۆ (مدینة).

شێخ (ألباني) دەڵێت: گومانمان نیە كە دەرچوونی دایكی ئیمانداران لە بنەڕەتدا هەڵەبوو، هەر لەبەر ئەم هەڵە بو لەسەر ئاوی (حوأب) ویستی بگەڕێتەوە، بەڵام (عبدالله)ی كوڕی (زبیر) قەناعەتی پێدەكات و دەڵێ: بەڵكو خوای گەورە بەهۆی تۆوە ئاشتەوایی بخاتە نێو موسڵمانانەوە، گومانیشمان نیە كە (عبدالله)ش لەو هەڵوێستەیدا هەڵەبوو، عەقلیش ئەوە یەكلایی دەكاتەوە كە خۆ حەشاردان نیە لە وتنی ئەوەی كە یەكێك لەم دوو لایەنە بەگژیەكدا چووە — كە سەدان كوشتاریان لێدەكەوێتەوە - هەڵەبوون، بێگومان (عائشة) خوای لێ ڕازی بێ لەو هەڵوێستەیدا هەڵە بوو لەبەر چەند هۆكارێكی زۆرو چەند بەڵگەیەكی ڕوون، لەوانە پەشیمانبوونەوەی لە ڕۆشتنی بۆ ئەوێ و، ئەو پەشیمانبوونەوەیش شایستەی چاكەو كامڵبوونیەتی و، هەڵەكەشی نەك تەنها لەسەری نانوسرێت بەڵكو لەو هەڵانەیە كە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت.

پاشان شێخ (ألباني) چەند بەڵگەیەك بۆ ئەم بەهەڵەداچوونەی دایكە (عائشة) خوا لێی ڕازی بێت دێنێتەوە:

١/ دایكە عائیشە دەڵێ بە (ابن عمر): یا أبا عبد الرحمن ما منعك أن تنهاني عن مسیري ؟، واتە: ئەی باوكی (عبدالرحمن) چی بەرگری لێكردی، كە نەهێڵی بڕۆم ؟

ئەویش دەڵێ: رأیت رجلاً غلب علیك. یعني ابن الزبیر، واتە: پیاوێكم بینی بەسەرتدا زاڵ بوو بوو — مەبەستی (عبدالله)ی كوڕی (زبیر)بوو.

(عائشــة) دەڵــێ: أما و الله لـو نهيتــني مـا خرجــت، واتــە: دەی سـوێند بـە خوا ئەگەر نەهیت لێبكــردباماية نەدەڕۆشــتم.

٢/ (قيس) دەڵێت: عائیشە وای نیازبوو لـە ژوورەكـەی خۆیـدا بنێــژرێت، وتــی: {إني أحدثت بعد رسول الله صلى الله عليه وسلم حدثا، ادفنـوني مـع أزواجـه، فدفنت بالبقـيع رضي الله عنها}، واتـە: بەڕاسـتی مـن لـە دوای پێغەمبـەری خــوا صـلى الله عليــه وسـلم شــتێكم كـردووە، {واتــە: دەرچـوونم لــە ڕۆژی (جمل)دا}، بۆیـە لـەلای خێزانـەكانی تـری بمنێـژن، ئیتــر لـە (بقيـع) نێـژرا خوای لـێ ڕازی بـێ.

٣/ (بخـاري)يش لە(صحيح)ەكەیدا لـە(أبـو وائـل)ەوە دەگێڕێتــەوە دەڵــێ: كاتێـك (علي و عمار و حسن) دەنێرێت بۆ (كوفة)، (عمـار) وتارێـك دەدات و تێیـدا دەڵــێ: {إنــي لأعلـم أنهــا زوجتــه فــي الـدنيا والآخـرة، ولكـنَّ الله ابتلاكــم لتتـبعــوه أو إيــاها، يعــني عائـشــة}، واتــە: بەڕاســتی مــن دڵنيـام كـە ئــەو خێزانــی پێغەمبــەری خوایــە صـلى الله عليـه وسـلم لـە دونیـاو لـە دوارۆژدا، بـەڵام خــوا تاقیتــان دەكاتــەوە بــۆ ئــەوەی بزانــێ، ئایـا شـوێنی فـەرمانی خـوا دەكەون، یــان شوێنی ئــەو (واتە: عائیشــە)[1].

## ژمـارەی ئەو فەرموودانـەی گێڕاوێتـیەوە :-

دایكـە (عائـشـة) خـوای لــێ ڕازی بێــت (٢٢١٠) فـەرموودەی لـە پێغەمبـەرەوە صلى الله عليه وسلم گێڕاوەتــەوە.

(١٧٤) فەرموودەیـان (متـفق عليــه)يەو، (٥٤) فەرموودەشـيان پێشەوا (بخاري) بە تەنها گێڕاوێتیەوەو (٦٩) فەرموودەشیان پێشـەوا (مسـلم) گێڕاوێتیەوە.

---

١) بڕوانە: سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤٧٣/١-٤٧٤) .

**دوو فەرموودەی هەڵبەستراوو لاواز لەبارەی دایکە (عائشة)وە:**

**فەرموودەی یەکەم: {خذوا شطر دينكم عن هذه الحميراء}[1]، واتە: نیوەی ئایینەکەتان لەم سپی پێستە وەربگرن.**

**وشەی (الحُمَيْراء) بچوککراوەی (الحمراء)ەو، مەبەست پێی سپی پێستە[2].**

**فەرموودەی دووەم: {عن العلاء بن عبدالكريم اليامي، عن عمار بن عمران، رجل من زيد الله، عن امرأة منهم، عن عائشة أنها شوّفت جاريةً، وطافت بها وقالت: (لعلّنا نصطادُ بها شبابَ قريش)[3]، واتە: (عائیشە) خوای لێ ڕازی بێت کچۆڵەیەکی پیشان داوەو گێڕاوێتیو وتوویەتی: بەڵکو لاوەکانی قورەیشی پێ ڕاوبکەین، ئەم فەرموودەیەش لاواز (ضعیف)ە لەبەر ئەم سێ هۆ (علـة)یەی خوارەوە:**

---

١) قال ابن كثير في تحفة الطالب (١/١٧٠): فهو حديث غريب جدا، بل هو منكر سألت عنه شيخنا الحافظ ابا الحجاج المزي فلم يعرفه وقال لم اقف له على سند إلى الآن، وقال شيخنا ابو عبد الله الذهبي هو من الأحاديث الواهية التي لا يعرف لها إسناد.

وقال السخاوي في المقاصد (٤٢١): (قال شيخنا - يعني ابن حجر - في تخريج أحاديث ابن الحاجب من إملائه: لا أعرف له إسناداً، ولا رأيته في شيء من كتب الحديث، إلا في (النهاية) لابن الأثير، ذكره في مادة (ح م ر) ولم يذكر من خرجه.

وكذا قال ابن القيم في (المنار المنيف)، ص: (٦١)، وقال الشيخ المحدث أحمد شاكر في (كلمة الحق)، ص (٤٨- ٤٩) لا أصل له أبداً، أي هو حديث مكذوب لم يقله رسول الله صلى الله عليه وسلم، وقال الألباني في إرواء الغليل (١/١٠): حديث موضوع.

٢) بڕوانە: لسان العرب (٤/ ٢٠٨)، هەروەها: النهاية في غريب الأثر: (١/١٠٤٤).

٣) رواه ابن أبي شيبة في مصنفه: (٣/٤٦١) .

١) له (سند)ى فەرموودەكەدا (عمار بن عمران)ى تێدايه هەر يەك له پێشەوا (الـذهبي) و(ابـن حجـر) دەڵـێن: (لا يـصح حديثـه، ذكـره البخـاري فـي الضعفاء)[١].

٢) پياوێكى نەناسراوى (مجهول) تێدايه: (رجل من زيد الله).

٣) هەروەها ئافرەتێكى نەناسراويشى تێدايه: (عن امرأة منهم).

كەوابوو ئەم فەرموودەيـه لاوازەو كـارى پێنـاكرێ، هەركەسێكيش بەبەڵگـه بيهێنێتەوە ئەوە يان دڵى نەخۆشە يا گيرفانى پێ پڕدەكات !!

دەبێ ئەوەشمان لەياد نەچێت، كە وشەى (جاريـة) لێـرەدا مەبەسـت پێـى ئەو كچۆڵەيه كە هێشتا باڵغ نەبووە !

## ئايا پلـەوپـايەى (خديجـة) گەورەترە، يان (عائشــة) خوايان لـێ ڕازى بێ؟

لەم بارەيەوە زانايان چەند ڕايەك،يان هەيە:

ڕاى يەكـەم: پلەو پايەى (عائشـة) گەورەترە، چونكە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى ڕێزى (عائشة) بەسەر ئافرەتـانى تـردا وەك ڕێـزى تێكوشـين بە گۆشـت وايـە بەسـەر خواردنـەكانى تـردا، كـاتێكيش (عمـرو)ى كوڕى (العـاص): پرسيارى له پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم كرد: كـێ خۆشـەويسـتـترين كەسە لـەلات ؟

فـەرمووى: (عائـشـه)، هـەروەها لەبـەر ڕۆڵـى گـەورەى (عائـشة) لـە بڵاوكردنەوەى زانستداو ... هتد.

ڕاى دووەم: پلـــەو پايـــەى (خديجـــة) بـــەرزترە، چـــونكە لـــە ســـەرەتاى پێغەمبەرايەتيدا ئيمانى پێهێناو بە ماڵو بە گيان پشـتگيـريى لێكـردووەو، خواى گەورە لەڕێگاى (جبريل)ەوە سەلامى لێكردووەو ... هتد.

---

١) ميزان الاعتدال للذهبي: (٣/١٦٦)، لسان الميزان لابن حجر: (٤/٣٧٢).

ڕای سێیەم: (خدیجـة) لـەڕووی زوو موسـڵمانبوونەوە پلەوپایـەی بـەرزترەو (عائشـة)ش لەڕووی بڵاوکردنەوەی زانستەوە پلـەوپایەی بەرزتـرە.

بەڵام پێشەوا (ابن کثیر) دەڵێت: لەڕاستیدا هەریەك لـەم دوو ئافرەتـە ئەوەنـــدە پلەوپایـــەیان بـــەرزە کاتێـــك بیـــری لێدەکەیتـــەوە سەرســـامو دەستەوسـان دەبیـت، بۆیـە واباشتـــرە قـسەی تێـدا نـەکرێتو باشتـــرینو سەلامەتتـرین ڕێگـا ئەوەیـە، کە بڵێین خوا زانـاترە[١].

## کۆچـی دوایـی

(ذکوان) دەڵـێ: لـەکاتی سـەرەمەرگی دایکـە (عائـشة)دا (ابـن عبـاس) داوای مۆڵەتی کرد تا بچێتە ژوورەوە بۆلای، (عبدالله)ی کوڕی (عبدالرحمن)ی بـرازای (عائـشة)ش لـەوێبوو، وتـی: ئـەوە (ابـن عبـاس)ە یەکێکـە لـە ڕۆڵـە باشـەکانت مۆڵـەتت لێدەخـوازێ تابێتــە ژوورەوە، وتـــی: (دَعْـنـِي مِـنْ ابْـنِ عَبَّــاسٍ وَمِـنْ تَزْكِيَـتِهِ)، واتـە: وازم لێبـێنە لە (ابن عباس)و لە پاکانەو ستایشەکانی.

(عبدالله) وتی: (ابن عباس) خوێنـەری کتێبـی خـواو شـارەزای ئایینەکەیـەتی مۆڵەتی بدەری با سڵاوت لێبکاو بە خوات بسـپێرێ.

وتی: (فَـأْذَنْ لَـهُ إِنْ شِـئْتِ). واتە: گـەر دەتـەوێ مۆڵـەتی بدە.

ئەویش مۆڵـەتیـدا، ئینجا هاتـە ژوورەوە پاشان سڵاوی کـردو دانیـشتو بـە (عائـشة)ی وت: مـژدە بـێ لێـت دایکـی ئیمانـداران سوێند بـەخوا نێوانی تـۆو هەلگرتنی ئـێشو ئـازارو گەیـشتن بـە خۆشـەویـستان (محمـد)و هـاوەڵانی هـەر ئەوەندەیە کە ڕۆحـت لە لاشـەت جیـابێتەوە.

(عائشـة)ش وتـی: (وَأَيْضَـا)، واتـە: چیتـر ؟

---

١) البدایـة والنهایة: (٣/١٥٨- ١٥٩) .

وتی: تۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆشەویسترین خێزانی بوویتو پێغەمبەری خوایش صلی الله علیه وسلم ئەوەی پاك نەبوایە خۆشی نەدەویست، خوای گەورە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە ئایەتی لەسەر پاکی تۆ ناردە خوارەوە، مزگەوت نیە لەسەر زەویدا شەو ڕۆژ ئەو ئایەتانەی تێدا نەخوێنرێتەوە، هەروەها لە ناوچەی (الأبواء)یش ملوانکەکەت لێکەوتو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلمو خەڵکیش لەگەڵیدا بە شوێنیدا دەگەڕان تارۆژیان لێبوویەوە ئاویان بەلاوە نەبوو، تاوەکو خوای گەورە بەهۆی تۆوە ئایەتی: ﴿... فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ...﴿٤٣﴾﴾ النساء، ی دابەزاند، سوێند بەخوا تۆ کەسێکی پیرۆزی.

دایکە (عائشة)ش وتی: (دَعْنِي يَا ابْنَ عَبَّاسٍ مِنْ هَذَا فَوَاللهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ نَسْيًا مَنْسِيًّا)[1]، واتە: ئەی (ابن عباس) وازم لێبێنە، سوێند بە خوا ئاوات دەخوازم کە لەبیرکراو بوومایە.

لە شەوی سێشەممەی (١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٨ ك) لە تەمەنی (٦٧) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، (أبو هريرة) نوێژی لەسەر کردو – (مروان) والی (مدينة) بوو لەوکاتەدا لە عومرە بوو – شەو دوای نوێژی (وتر) لە گۆڕستانی (البقيع) نێژرا، خەڵکی (مدينة و العوالي) بۆ جەنازەکەی کۆبوبونەوەو دەیانوت: هیچ شەوێکمان نەدیوە بە ئەندازەی ئەمشەو ئافرەت تێیدا کۆبوبێتەوە.

پێنج کەس دابەزینە ناو گۆڕەکەیەوە: (عبدالله و عروة) کوڕانی (زبیر)، کە خوشکەزای بوون، (قاسم و عبدالله) کوڕانی محمد، کە برازای بوون، (عبدالله)ی کوڕی (عبدالرحمن) ئەویش هەر برازای بوو.

---

١) رواه أحمد في مسنده برقم: (٣٢٦٢) وصححه شعيب الأرناؤوط.



المسجد النبوي في عهد الرسول صلى الله عليه وسلم والقبلة إلى المسجد الحرام في مكة

نەخشەی ماڵی (سودة)و (عائشة) بەتەنیشت مزگەوتی (مدینة)وە

# حەفصەی كچی عومەر خوایان لێ ڕازی بێت [1]

ناوی: (حفصة)ی كچی (عمر)ی كوڕی (الخطاب)ی كوڕی (نفیل)ی كوڕی (عبد العزی)ی كوڕی (رباح)ی كوڕی عبدالله القرشي.

دایكی: ناوی (زینب)ی كچی (مظعون)ی كوڕی (حبیب)ی كوڕی (وهب)ی كوڕی (حذافة)یە.

دایكە (حفصة) خوشكی (عبد الله)ی كوڕی (عمر)ە لە دایكو باوكەوە، پێنج ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لە دایك بووە.

پێشتر خێزانی (خنیس)ی كوڕی (حذافة)ی كوڕی (قیس)ی كوڕی (عدي) (السهمي) بووە.

هەردووكیان پێكەوە كۆچ دەكەن بۆ (الحبشة) پاشان دەگەڕێنەوەو دواتر كۆچ دەكەن بۆ (مدینة)، مێردەكەی بەشداری غەزای (بدر) و (أحد) دەكات، لە دووەمیاندا بریندار دەبێو، دواتر بەهۆیەوە لە (مدینة) كۆچی دوایی دەكاتو (حفصة) لە تەمەنی (٢١) ساڵیدا بەجێ دێڵێ.

## خوازبێنی كردنی (حفصة) لە ساڵی (٣)ی كۆچیدا

(عبدالله)ی كوڕی (عمر) خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە دەڵێت: كاتێك، كە (حفصة) بێوەژن دەبێ (عمر) دەڵێ: گەشتم بە (عثمان)ی كوڕی (عفان)- دوای كۆچكردنی (رقیّة)ی خێزانی- باسی (حفصة)م بۆ كردوو، وتم: ئەگەر بتەوێ (حفصة)ت لێ ماردەكەم.

---

١) الإصابة: (١٢/٩١-٩٤)، البداية والنهاية (٨/٣٣-٣٤)، سير أعلام النبلاء: (٢/٢٢٧-٢٣١).

ئەويش وتى: با بيرێكى لىٚ بكەمەوە.

(عمر) دەڵىٚ: چەند شەوێك چاوەڕوانيم كرد، پاشان هاتەوە، وتى: وام پێباشە، كە لەم ماوەيەدا ژن نەهێنم.

پاشان گەشتم بە (أبوبكر)و، پێم وت: ئەگەر بتەوىٚ (حفصة)ت لىٚ مارە دەكەم.

(أبوبكر) بێدەنگ بوو، هيچ وەڵامێكى نەدامەوە، ئەم هەڵوێستەييم لەوەى (عثمان) بەلاوە ناخۆشتر بوو، چەند شەوێكى بەسەرداچوو، پێغەمبەرى صلى الله عليه وسلم خوا داواى كردو منيش لێم مارەكرد، پاشان گەشتم بە (أبوبكر)و پێى وتم: لەوانەيە گلەييت لێم هەبىٚ، كە باسى (حفصة)ت بۆ كردمو وەڵامم نەدايتەوە ؟

وتم: بەڵىٚ.

وتى: فإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أنْ أرْجِعَ إِلَيكَ فِيمَا عَرَضْتَ إلا أنّي قَدْ عَلِمْتُ أنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ قَدْ ذَكَرَهَا فَلَمْ أكُنْ لِأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ وَلَوْ تَرَكَهَا لَقَبِلْتُهَا[1]، واتە: تەنها لەبەر ئەوە وەڵامم نەدايتەوە كە دەمزانى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم باسى كردووەو، نەمدەويست نهێنييەكى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم ئاشكرا بكەم، ئەگەر وازى لىٚ بهێنايە من دەمويست.

لە ريوايەتێكى تردا هاتووە، كە (عمر) دواى ئەو هەڵوێستەى (أبوبكر)و (عثمان) سكاڵا بۆ لاى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم دەبات: ئەويش دەفەرموىٚ: {يتزوج حفصة من هو خير من عثمان، و يتزوج عثمان من هي خير من حفصة، ثم خطبها، فزوجه عمر}[2]، واتە: كەسێك خوازبێنى

---

١) البخاري: (٤٠٠٥، ٥١٤٥) .

٢) أخرجه ابن سعد في الطبقات: (٨٢/٨)، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد (٢/١٠): وفي إسناده الوليد بن محمد الموقرى وهو ضعيف.

(حفصة) دەکات لە (عثمان) باشترەو، کەسێکیش شوو بە (عثمان) دەکات، کە لە (حفصة) باشترە، پاشان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوازبێنی دەکاتو، (عمر)یش لێی مارە دەکات.

## پلەو پایەو سەروەرییەکانی

١- (جبریل) ڕێگە نادات پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەڵاقی بدات:- {عن عمر بن الخطاب أنّ رسول الله صلى الله عليه وسلم طلق حفصة ثم راجعها، وفي رواية أخرى: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: قال لي جبريل: راجع حفصة فإنّها صوّامة قوّامة وإنّها زوجتك في الجنّة}[1]، واتە: (عمر)ی کوڕی (الخطاب) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (حفصة)ی تەڵاقداو پاشتان گەڕاندیەوە.

لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (جبریل) پێی وتم: (حفصة) بگەڕێنەرەوە، چونکە ڕۆژووی زۆر دەگرێو شەونوێژی زۆر دەکاتو خێزانیشتە لە بەهەشتدا.

سوود: هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ئەوەی، کە پیاو دەتوانێ خێزانی تەڵاق بدات با (صوّامة و قوّامة)ش بێت، ئەمەش لە کاتێکدایە، کە ژن لەگەڵ پیاوەکەیدا نەگونجێو گوێڕایەڵ نەبێ، یان هۆکاری تر هەبێ کە پێویست نەکات کەسی تر بیزانێ جگە لە خۆیان.

٢- شارەزای قورئانی پیرۆز بوو:- عن أم مبشر، أنها سمعت النبيّ صلى الله عليه وسلم يقول عند حفصة: {(لا يدخل النار، إن شاء الله، من أصحاب الشجرة أحد، الذين بايعوا تحتها) قالت: بلى، يا رسول الله فانتهرها،

---

١) السلسلة الصحيحة للألباني: (٦/٥: رقم ٢٠٠٧) .

فقالت (حفصة): وإن منكم إلا واردها فقال النبي صلى الله عليه وسلم: قد قال الله عز وجل: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ مريم}[1]، واته: (أم مبشر) دەڵێ: لای (حفصة) بووم بیستم پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: هیچ کام لە هاوەڵانی درەختەکە ناچنە ئاگر - إن شاء الله - ئەوانەی پەیمانیان بەست لە ژێریدا.

(حفصة) وتی: دەچن ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ! پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لێی تورە بوو.

(حفصة) وتی: ئەوەنیە، خوا دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ... ﴿٧١﴾ ﴾ مریم، واته: کەس نیە لە ئێوە نەچێتە ناو دۆزەخەوە، بە تەفسیرێکی تر (کەس نیە لە ئێوە بەسەر دۆزەخدا تێنەپەڕێت).

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: بەڕاستی خوا دەفەرموێت: (پاشان ئەوانەی پارێزکارو لە خواترسن لە ئاگرەکە ڕزگاریان دەکەین و ستەمکارانی تیا دەهێڵینەوە لەسەر ئەژنۆ).

٣- فەرمانی کوشتنی کەنیزەکێکی جادوگەری خۆی دەدات:- {عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعْدِ بْنِ زُرَارَةَ، أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ حَفْصَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَتَلَتْ جَارِيَةً لَهَا سَحَرَتْهَا، وَقَدْ كَانَتْ دَبَّرَتْهَا، فَأَمَرَتْ بِهَا فَقُتِلَتْ[2]، واته: (حفصة)ی کچی (عمر) خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ بڕیاری کوشتنی کەنیزەکێکی خۆی دەدا پاش ئەوەی جادووی لێدەکا.

---

١) رواه مسلم: ٦٥٦٠ .

٢) موطأ الإمام مالك (٢٥٧٥)، والبيهقي في معرفة السنن والآثار (٥٢٥٠) والشافعي في مسنده: (١٧٩٠).

٤- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەوڵى ڕازيکردنى دەدا- عن أنس: {أن رسول الله صلى الله عليه وسلم كانت له أمة يطؤها، فلم تزل به عائشة و حفصة حتى حرّمها، فأنزل الله، عزّ وجل: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١﴾ التحريم[1]، واته: (أنس)ى كوڕى (مالك) دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەنیزەکێکی هەبوو کاری شەرعی لەگەڵدا دەکرد، (عائشة و حفصة) وازیان لێنەهێنا تا یاساغی کرد لەسەرخۆی (قەدەغەی کرد لەخۆی)، پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەکەیت، خوا بۆی حەلاڵ کردوویت ؟ دەتەوێ ژنەکانت ڕازی بکەیت ! خوا لێخۆش بوو میهرەبانە.

زانایانی ڕاڤەکار (تفسیر) دەڵێن: پێغەمبەر جارێك لە ماڵو نۆرەی (حفصة)دا دەبێت لەگەڵ (مارية) کۆدەبێتەوە، جا کە (حفصة) بینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ماڵو نۆرەو جێگەی مندا.

فەرمووی: ڕازی دەبی، ئەگەر لە خۆمی حەرام کەمو نزیکی نەبمەوە ؟ وتی: بەڵێ. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم حەرامی دەکاو دەفەرموێت: دەی بۆ کەس باسی مەکە، بەلاّم (حفصة) بۆ (عائشة)ی باس دەکات[2].

﴿قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٢﴾ التحريم بەڕاستی خوا بژاردنی سوێندەکانتان بە پێویست دادەنێو، خواش گەورەو یارمەتیدەرتانەو، هەرئەویش زاناو دانایە. ﴿وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ

---

١) (صحيح)؛ بڕوانە: صحيح و ضعيف، سنن النسائي (٣٩٥٩).

٢) بڕوانە: تفسير إبن كثير بتحقيق العلامة احمد شاكر (٥٤٣/٣) .

أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا ... ﴾، كاتێك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قسەیەكی لای هەندێ لەژنەكانی واتە: (حفصة) باسكرد ﴿...فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ ...﴾، كاتێك (حفصة) قسەكەی گەیاندە (عائشة) ﴿...وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ...﴾، خوا پێغەمبەری لێ ئاگادار كردەوە ﴿...عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ ...﴾، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم هەندێكی بۆ (حفصة) باسكردوو لە هەندێكیشی خۆی بێئاگا كرد، ﴿... فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٣﴾ ﴾ التحريم، كاتێك گێڕایەوە بۆ (حفصة)، وتی: كێ ئەمەی بۆ گێڕایتەوە !؟ فەرمووی: خوای زاناو بە ئاگا ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ ...﴾ ئەگەر هەردووكتان پەشیمان ببنەوە، بەراستی دڵتان لایدابوو لە حەق ﴿... وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾ التحريم، وە ئەگەر پشتگیری یەكتر بكەن لەدژی پێغەمبەر، ئەوا خوا پشتیوانیەتی و هەروەها (جبریل)و بڕوادارە چاكەكانیش‌و دوای ئەمانیش فریشتەكان پشتیوانن بۆی[1].

هەروەها (عبدالله)ی كوڕی (عبّاس) دەڵێ: {مَكَثتُ سَنَةً وَأنَا أُريدُ أن أسألَ عُمَرَ بنَ الخَطّابِ عَنْ آيَةٍ فَمَا أستَطِيعُ أن أسألَهُ هَيبَةً لَهُ حَتّى خَرَجَ حَاجًّا فَخَرَجتُ مَعَهُ فَلَمّا رَجَعَ فَكُنّا بِبَعضِ الطّرِيقِ عَدَلَ إلَى الأرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ فَوَقَفتُ لَهُ حَتّى فَرَغَ ثُمَّ سِرتُ مَعَهُ فَقُلتُ يَا أمِيرَ المُؤمِنِينَ

---

١) ئەمە ڕای یەكەمە، ڕای دووەمیش لە ژیانی (زینب)ی كچی (جحش)دا خوای لێ ڕازی بێ باسی دەكەی.

مَنْ اللّتانِ تظاهَرَتـا علَى رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم مِنْ أزْوَاجِهِ ؟ فقَالَ: تِلْكَ حَفْصَةُ و عائِشَةُ}[1]، واتـە: مـاوەی یـەك سـاڵ دەمویـست پرسـیار لـە (عمر)ی کوڕی (الخطاب) بکـەم لـەبارەی ئایەتێکـەوە، کەچـی نەمـدەتوانی، چونکە شـەرمم لێـدەکرد، هـەتا ڕۆژێك چـوو بـۆ حــەج و منـیش لەگەڵێـدا ڕۆشتم، کاتێك گەڕاینەوە لەلای درەختێك لایدا بۆ پێویستی خۆی و منـیش بەدیاریــەوە وەستام تا لێبوویــەوە، پاشــان لەگەڵێدا کەوتمە ڕێ و پێمگـوت: ئەی ئەمیـری ئیمانداران، ئەو دوو خێزانەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کێ بوون کە پشتگیـری یەکتـریان کرد، لە بەرامبـەر پێغەمبـەردا صـلى الله عليه وسلم ؟

گوتی: (حَفْصَـة و عائشَـة) بوون.

٥- ئافرەتێکـی خوێنــدەوار بــوو:- {عـن الـشفاء بنــت عبـدالله قالــت: دخـل رسـول صـلى الله عليـه وسـلم الله وأنـا عنـد حفـصة، فقــال ألا تعلمـين هـذه رقيــة النملــة كمـا علمتيهـــا الكتـــابة}[2]، واتـــە: (الــشــفاء)ی کــچــی (عبدالله) وتـی: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم، هاتـەوە مـن لـەلای (حفـصة) بــووم پێــی فــەرمووم: بــۆ ئەمـــە {واتـە: (حفـصــة)} فێـری نوشتەی (النَّمْلـة)[3] ناکـەی هەروەك چۆن فێری نوسـینت کردووە.

---

١) البخاري: ٢٢٨٨ و مسلم: ٢٧٠٥.

٢) رواه أحمـد: ٢٥٨٤٧ و أبـو داود: ٣٣٨٩ و النـسائي: ٧٥٤٣ و الطبــراني فــي الكبيــر: ٢٠٦٢١، بڕوانە: السلسـلة الصحيحة للألبـاني: (١٩٣١).

٣) نوشــتەی (النَّمِلَـة): قــسەیەك بــووە لــەناو ژنــانی عەرەبــدا بــاوبووەو ســوودو زیــانی نەگەیاندووە، بە بووکیان وتووە لەکاتی گواسـتنەوەیدا: (تحتفِل وتختضِب وتكتحِل وَكُلّ شَيْء يَفْتَعِل غَير أن لا تعْصِي الرَّجُـل)، واتـە: ئاهـەنگ دەگێـڕێ و خەنـەو وسمـە ئـەدا لـە

سوود: لەناو خێزانەكانی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم سیانیان خوێندەواربوون (حفصة و عائشة و أمُ سَلَمة) خوا لێیان ڕازی بێ.

٦- پارێزەری (مُصحَف)ەكەی (أبو بكر) بوو:- {عن زَيْدَ بنَ ثابتٍ الأنْصَارِيَّ رَضيَ اللهُ عَنـه': كانت الصحف التي جمع فيها القرآن عند أبي بكر حتى توفاه الله، ثم عند عمر حتى توفاه الله ، ثم عند حفصة بنت عمر[1]، فأرسل عثمان إلى حفصة أن أرسلي إلينا بالصحف ننسخها في المصاحف ثم نردها إليك ثم ردها إليها[2]، واتە: (زید)ی كوڕی (ثابت)ی (الأنصَارِي) خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: ئەو لاپەڕانەی قورئانی تێدا نوسرایەوە لای (أبو بكر) بوو هەتا وەكو كۆچی دوایی كرد، پاشان لای (عمر) بوو تا ئەویش كۆچی دوایی كرد، پاشان كەوتە لای (حفصة)ی كچی (عمر)، ئینجا (عثمان) دەنێرێ بۆلای (حفصة) پێی دەڵێ: بۆمان بنێرە با لەبەری بنووسینەوە، پاشان بۆت دەگەڕێنینەوە، دوایی بۆی گەڕاندەوە.

وە هەر لەلای دەمێنێتەوە تا (مروان)ی كوڕی (الحكم) دەنێرێ بە شوێنیدا بەڵام (حفصة) ڕازی نابێ‌و نایداتە دەستی، بەڵام كاتێك (حفصة) كۆچی دوایی دەكات (مروان) پاش گەڕانەوەیان لە ناشتنی، دەنێرێ بە شوێنیدا بۆ لای (عبدالله)ی برای، ئەویش پێی دەدا، ئینجا (مروان)

---

قژی‌و چاوی كل دەكات‌و هەموو شتێك دەكات، جگە لە سەرپێچیكردنی پیاو)، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم مەبەستی ئەوە بووە، كە ئەم قسەیە ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ (حَفصَة)، چونكە نهێنییەكی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم دركاندبوو، بڕوانە: عون المعبود (٤١٣/٨).

١) رواه البخاري: ٤٣١١ .

٢) صحيح مشكاة المصابيح للألباني، برقم: ٢٢٢١ .

ئەیدڕێنیو دەڵێ: بۆیە ئەمەم کرد، چونکە ئەوەی تێیدا بووە نووسراوەتەوە، ترسام لە داهاتوودا لەسەر ئەم (مصحف)ە گومانداڕێك گومانی بۆ دروست ببێ، یان بڵێت: هەندێکی لێ نەنوسراوەتەوە[١].

٧- به سۆزو بەزەیی بوو:- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ حَفْصَةَ بَكَتْ عَلَى عُمَرَ فَقَالَ مَهْلًا يَا بُنَيَّةُ أَلَمْ تَعْلَمِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ إِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ[٢]، (عبدالله)ی کوڕی (عمر) دەڵێت (حفصة) گریا بۆ (عمر) ئەویش وتی: ئایا نازانی، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: مردوو سزا دەدرێ بەهۆی گریانی کەسوکاری بۆی[٣].

٨- ماڵ (حجرة)ەکەی دەبەخشێ بەمزگەوت:- کاتێك (عثمان)ی کوڕی (عفان) بۆ یەکەمین جار مزگەوتەکەی (مدینة) گەورە دەکات، پێویستی بە ماڵەکەی (حفصة) دەبێت، ئەویش دەڵێ: ئەی چۆن بچم بۆ مزگەوت ؟

(عثمان)یش دەڵێت: لە ماڵەکەی خۆت فراوانترت ئەدەینێو ڕێگەی مزگەوتیشت بۆ چاك دەکەین، ئینجا ماڵەکەی (عبدالله)ی کوڕی (عمر)ی کوڕی (الخطاب)ی دەدەنێ[٤].

٩- بەشداری ڕووداوی (صفین) ناکات:- دایکە (حفصة) خۆی ئامادە دەکات کە لەگەڵ (عائشة)دا بچێت بۆ (بصرة)، بەڵام دوایی پەشیمان دەبێتەوەو بەشداری ڕووداوی (صفین) ناکات.

---

١) جمع القرآن الكريم حفظا وكتابة، للدكتور: علي سليمان العبيد ص (٥٢).

٢) رواه مسلم: ١٥٣٦ .

٣) زانایان لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا، دەڵێن: ئەگەر لەدونیادا بە کەسوکاری وتبێ بۆم بگرین.

٤) خلاصة الوفا بأخبار دار المصطفى للسمهودي: (١٢٩/١) .

## ژمــارەی ئەو فەرمووودانــەی گـێڕاویەتیــەوە

(٦٠) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم گێڕاوەتەوە، چواریـان (متفق علیــە)یە، (٦)یان لە (صـحیح مسـلم) دایە.

## كۆچــی دوایـی (حفصــة)

لە مـانگی (شــعبان)ی ســاڵی (٤٥)ی كۆچی لـە تـەمـەنی (٦٠) سـاڵیدا كۆچی دوایی دەكات لەسـەر ڕای زۆرینـە (جمهور)، (مـروان)ی كوڕی (الحكـم) نوێـژی لەسەر دەكاتو (أبو هریرة) دەیبات بۆ گۆڕسـتانی (البقیع)و لەوێ دەینێـژێت.

# زەینەبی کچی خوزەیمە خوای لێ ڕازی بێت [1]

ناوی (زینب)ی کچی (خزیمة)ی کوڕی (الحارث)ی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عبد مناف)ی کوڕی (هلال)ی کوڕی (عامر)ی کوڕی (صعصعة العامري)یە.

لە سەردەمی نەفامیدا بە دایکی هەژاران (أم المساكين) ناسراوبوو، چونکە هەمیشە خواردنی بە هەژاران داوەو چاکەی لەگەڵ کردوون.

پێشتر خێزانی (عبد الله)ی کوڕی (جحش) بووە لە غەزای (أحد)دا شەهید کرا.

هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن: خێزانی (الطفيل)ی کوڕی (الحارث)ی کوڕی (عبد المطلب)ی کوڕی (عبد مناف)ە، تەڵاقی دەداتو پاشان براکەی (عبيدة)ی کوڕی (الحارث) خوازبێنی دەکاتو، لە غەزای (أحد)دا شەهید دەبێت، پاشان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٣)ك، {(٣٠) مانگ دوای کۆچکردن} خوازبێنی دەکات.

(أم المساكين) خوشکی (ميمونة)ی خێزانی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم لە دایکەوە.

---

١) الإصابة: (١٢/١٧٤- ١٧٥)، تأريخ الإسلام: (١/٢٢٩)، البداية والنهاية: (٤/١٠٣)، تفسير القرطبي: (١٤/١٦٦)، أسد الغابة: (٧/١٤٢- ١٤٣).

## كۆچـی دوایـی

(٢) مانگ، یان (٣) مانگ هەنـدێكی تـر دەڵێن (٨) مـانگ لـەلای پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم دەمێنێتـەوەو، پاشـان هـەر لـە (مدینـة) لـە كۆتـایی مانگی (ربیع الآخر)دا لە تەمەنی (٣٠)ساڵیدا كۆچی دوایی دەكات.

پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم خـۆی نوێـژی لەسـەر دەكـاتو لـە گۆڕستانی (البقیع) دەنێژرێت.

هیچ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم نەگێڕاوەتـەوە.

لەناو خێزانەكانی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم تـەنها (زینـب و خدیجـة) خوایان لـێ ڕازی بێت پێش خۆی كۆچی دواییان كردووە.

# ئوم سەلەمە (هیندی كچی ئەبو ئومەییە)

## خوای لێ ڕازی بێت [١]

نـاوی: (أم سـلمة) (هنـد)ی كـچی (أبـو أميـة)ی كـوڕی (الـمغيرة)ی كـوڕی (عبدالله)ی كوڕی (عمرو)ی كوڕی (مخزوم)ی (قرشـي)یە.

باوكی بە (زاد الركب) ناسراوە، واتە: توێشوی كاروان، چونكە زۆر بەخشندە بووە هەر كەسێك لەگەڵیدا سەفەری بكردایە پێویستی بە توێشوو نەدەبوو.

دایكیشی ناوی (عاتكـة)ی كچی (عـامر)ی كوڕی (ربيعـة)ی كوڕی (مالك)ی (الكنانيـة)یە لە هۆزی (بنـي فراس).

هاوسەری یەكـەمی (أم سلمة) ئامۆزایەكی خۆی بووە كە نـاوی (أبـو سـلمة)ی كوڕی (عبد الأسـد)ی كوڕی (المغيـرة)یە، كوڕی پوری پێغەمبەری خوایـە صـلى الله عليـه وسلم، واتـە: كـوڕی (بــرّة)ی كـچی (عبـد الـمطلب)ە، هـەروەها بـرای شیـری پێغەمبەری خوایشە صلى الله عليه وسـلم، چـونكە هـەردووكیان شیــری (ثويبـة)ی كەنیزەكی (أبو لـهب)یان خواردووە.

(أم سلمة) چـوار منـاڵی لـە (أبـو سـلمة) بـووە: (عمـر، سـلمة، زينــب، دُرَّة) جگە لە (دُرَّة) ئەوانی تر لە هـاوەڵانـن خوایان لێ ڕازی بێ.

ئەم دوو هاوسەرە كۆچ دەكەن بۆ (حبشـة)و لـەوێ خـوای گـەورە (سلمة)یـان پێدەبەخشێو دواتر دەگـەڕێنەوە بۆ (مكـة).

---

١) الإصـابة: (١٢/٣٧٣- ٣٧٥)، الاسـتيعاب: (٢/١٢٩،١٢٥)، البدايـة والنهـاية: (٤/١٠٤- ١٠٥)، سيــر أعلام النبــلاء: (٢/٢٠١-٢١٠).

## کۆچکـردن بۆ (مدینـة)

(أم سـلمة) دەڵـێ: (أبـو سـلمة) بڕیاریـدا کـە کۆچکـەین بـۆ (مدینـة)، وشتـرەکەی هێنـاو مـنو (سـلمة)ی کـوڕمی سـوارکردو خۆشـی لـە پێشیەوە ڕۆیی‌و جڵەوی وشترەکەی گرت، کاتێك پیاوانی (بنـو المغیـرة) دیتیان هـاتن، وتیـان: هـەقمان بەسـەر خۆتـەوە نیـە، بـەڵام ژنەکـەت کەسـی ئێمەیـەو ڕێگە نـادەین لەگـەڵ خـۆت بیبـەی، جڵـەوی وشـترەکەیان لەدەسـت سـەندو مـنو (سلمة)یان لەگەڵ خۆیان گـەڕاندەوە.

پاشـان خێلـی (عبدالأسـد)، کـە کەسـی (أبـو سـلمة) بـوون تـووڕەیی گرتنـی‌و هـاتن، وتیـان: سـوێند بـەخوا نایـەڵین ئـەم منداڵـەش لـەلای دایکی بمێنێتـەوە، هـەردوولایان (سـلمة)یـان ڕادەکێـشا تـاوەکو دەسـتێکیان لـەبن دەرهێنـاو لـە ئەنجامدا خێڵـی (عبد الأسد) بردیان بۆ لای خۆیـان.

خێڵـی (بنـو المغیـرة)ش منیـان لای خۆیـان هێـشتەوەو (أبـو سـلمة)ی هاوسەریشم ڕۆشت بۆ (مدینة)، منیش زۆر خەمباربووم هەموو بەیانیانییەك دەهاتمـە (الأبطـح)[1] لـەوێ تـا ئێـوارە دەگریـام، حـەوت ڕۆژم بـەم شـێوەیە بەسـەربرد، تـاوەکو ڕۆژێکـیان یـەکێك لـە ئامۆزاکـانم بەلامـدا تێپـەڕی‌و فرمێسکی بە چاومەوە بینـی، پاشـان ڕۆشـت بـۆ لای خێڵـی (بنـو المغیـرة)و، پێـی وتـن: ئـەم ئافرەتـە هـەژارە بـۆ ئـازاد ناکـەن ؟ خـۆی‌و مێردەکـەیی‌و کوڕەکەیتان لەیەك جیاکردۆتەوە ؟!

ئـەوەبوو هـاتن بـۆ لامو پێیـان وتم: ئەگـەر دەتـەوێ کـۆچ بکـە بـۆ لای مێردەکـەت، ئینجـا خێڵـی (عبـد الأسـد)یـش کوڕەکـەیان بـۆ هێنامـەوە، منـیش سـواری وشـترەکەم بـووم‌و کوڕەکـەم لـەباوەش گـرت‌و، بەشـوێن مێردەکەمـدا

---

١) ناوی شـوێنێکە لە (مکـة).

بەرەو (مدينـة) بـە تـەنها بەڕێکـەوتم، لـە ڕێگـادا بەهەرکـەس دەگەشـتم گـوێم پێنەئـەداو بەلايـدا تێدەپەڕيـم، تـاوەکو گەيـشتمە (التنعـيم)[1] لـەوێ (عثمان)[2]ی کوڕی (طلحـة)م بينى، وتى: بۆ کوێ کچەکەی (أبو أميـة) ؟

وتم: بەرەو (مدينة) بۆ لای مێردەکـەم.

وتی: کەسـت لەگەڵـە ؟

وتم: نە بە خـوا، جگە لە خـواو کوڕەکـەم.

وتی: سوێند بەخوا بەتەنها بەجێت ناهێڵم!

جڵـەوی وشتـرەکەی گرتو خۆشی لە پێشيەوە ڕۆيی، سوێند بە خـوا لەنـاو عەرەبدا هيچ پياوێکم نەناسيوە لـەو بـەڕێزتر، لـەکاتی دابەزينـدا وشتـرەکەی يـخ ئەداو دووردەکەوتەوەو لە بن درەختێکدا ڕادەکشـا، کە کاتی ڕۆشـتن نزيـك دەبوويـەوە هەڵدەسـتا وشتـرەکەمی ئامـادەدەکردوو ديـسان دووردەکەوتـەوەو دەيـوت سـەرکەوە، کاتێـك سـواردەبووم‌و ئامـادەدەبووم دەهاتـەوە جڵـەوی وشـترەکەمی دەگـرتو بـە ڕێدەکـەوت، بـەردەوام وايـدەکـرد تـاوەکو گەشـتينە لادێـی (بنـي عمـرو)ی کوڕی (عـوف) لـە (قبـاء)، ئينجا وتـی: مێردەکـەت لـەم لادێيـە.

دەڵێن: لەناو ئافرەتاندا يەکەمين کەس بووە کۆچ بکـا بـۆ (حبشـة)و پاشـان بۆ (مدينة).

وتراويشـە: (ليلـی)ی ژنی (عامر)ی کوڕی (ربيعة) پێشتـر کۆچی کردووە.[3]

---

١) ئەميش ناوی شوێنێکە لەنێوان (مكة و سَرِف) نزيکەی (١١) کم لە (مكة)وە دوورە.

٢) (عثمـان)ی کـوڕی (طلحـة) دوای ڕوداوی (حديبيـة) لەگـەڵ (خالـد)ی کـوڕی (الوليـد) موسـڵمان دەبێـتو پێکـەوە کـۆچ دەکـەن بـۆ (مدينـة)، لـەدوای ڕزگـارکردنی (مكـة)ش پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کليلـەکانی (كعبة)ی بۆ دەگەڕێنێتەوە.

٣) رواه إبن إسحاق، بڕوانە: الإصابة: (٤ /٩٥)، البـداية والنهـاية: (٢٠٨/٣).

(أبو سلمة) بەشداری هەردوو جەنگی (بدر و أحد) دەکاو لە دووەمیاندا بریندار دەبێ‌و، بۆماوەی مانگێك برینەکەی تیمار دەکات‌و ئەندازەیەك چاك دەبێتەوە، پاشان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیکاتە سەرکردەی سریەیەکی سەدو پەنجا کەسی‌و ئەدا بەسەر خێڵی (بنو أسد)داو دەستکەوتێکی باشی دێنێ‌و دەگەڕێتەوە بۆ (مدینة)، پاش حەڤدە ڕۆژ برینەکەی سەر هەڵدەداتەوەو لە کۆتایی مانگی (جمادي الاولى)ی ساڵی (٤)ی کۆچی دوایی دەکات[1].

## خوازبێنی کردنی لە ساڵی (٤)ی کۆچیدا

ڕۆژێکیان (أم سلمة) وتی بە (أبو سلمة): بیستوومە هەر ژنێك مێردەکەی بمرێ ئەگەر بەهەشتی بێت، پاشان ژنەکەی شوو نەکاتەوە، خوای گەورە هەردووکیان لە بەهەشتدا کۆدەکاتەوە.

دەی وەرە بەڵێنم بدەرێ تۆ لەدوای من ژن نەهێنی، منیش لە دوای تۆ شوو نەکەم.

(أبو سلمة) وتی: جا بە گوێم دەکەی ؟ وتی: بەڵێ.

وتی: ئەگەر من مردم تۆ شوو بکە، خوایە لەدوای من پیاوێك ببەخشە بە (أم سلمة) لە من باشتربێ بۆی، خەمباری نەکات‌و ئازاری نەدا[2].

(أمُ سَلَمَة) دەڵێ: بیستومە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (هەر موسڵمانێك کارەساتێکی توش ببێ‌و ئەوەی خوا فەرمانی پێکردووە

---

١) البداية و النهاية: (١٠٤/٤) .

٢) أخرجه ابن سعد في الطبقات: (٨٨/٨)، قال شعيب الأرناؤوط في تحقيقه لسير أعلام النبلاء (٢٠٣/٢): ورجاله ثقات، وذكره إبن حجر في الإصابة: (٧١/٤).

بیلێت: {﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ اللَّهُمَّ أجُرْني في مُصِيبَتي وأخْلِفْ لي خَيْرًا مِنْهَا إلا أخْلَفَ اللهُ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا}، واتە: (ئێمە هی خواین‌و بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە خوایە پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەو بەڵایەی تووشم بووە، چاکترم پێبەخشە لەوەی لێت سەندووم)، خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بە باشتر لەوەی کەلێی سەندۆتەوە، (أمُّ سَلَمَةَ) دەڵێ: کاتێ (أبو سَلَمَةَ) کۆچی دوایی کرد، منیش ئەم دوعایەم کرد، ئیتر ئەوە بوو خوای گەورە لەو چاکتری پێبەخشیم کە پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه وسلم.

هەروەها دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (حَاطِب)ی کوڕی (أبي بَلْتعَةَ)ی نارد بۆ خوازبێنیم، منیش وتم: من کچێکم هەیەو ژنێکیشم بەرامبەر بە پیاو غیرەت زۆردەبەم.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: {أمَّا ابْنَتُهَا فَنَدْعُو اللهَ أنْ يُغْنِيَهَا عَنْهَا وَ أدْعُو اللهَ أنْ يَذْهَبَ بالغَيْرَةِ}[1]، سەبارەت بە کچەکەی دوعای بۆ دەکەین، کە خوا بێنیازی بکا لە دایکی‌و، داواش لە خوا دەکەم ئەو غیرەتەی لاببا.

ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیخوازێت‌و پێی دەفەرموێ: {أمَا إنّي لا أنقصك مما أعطيت فلانة رحيين و جرتين و وسادة من أدم حشوها ليف}[2]، واتە: {لەوە کەمترت پێنادەم کە بە فلانە خێزانم داوە، واتە: (زینب)ی کچی (خزیمة) کە دوو دەستاڕو دوو گۆزەو ڕاخەرێك لە پێستی خۆشەکراو، کە ناوئاخنەکەی لە ڕیشاڵی دارخورما بووە}.

---

١) رواه مسلم: (١٥٢٥).

٢) قال شعيب الأرناؤوط وطائفة من المحققين: أخرجه ابن سعد: (٩٠/٨) وأحمد: (٣١٣/٦، ٣١٤، ٣١٧)، والنسائي: (٦/ ٨١، ٨٢)، وإسناده صحيح، كما قال الحافظ إبن حجر في الإصابة: (١٣/ ٢٢٣)، وصححه ابن حبان: (١٢٨٢) والحاكم: (١٧/٤)، و وافقه الذهبي.

کاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیویست بچێتە لای (أمِّ سَلمَة)، (زینب)ی دەخستە باوەشی‌و شیری دەدایە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر شەرمن‌و بەرێز بوو شەرمی دەکرد، چەند جارێك بەو شێوەیە دەگەڕایەوە، تاوەکو (عمار)ی کوڕی (یاسر) هەستی بەم کارەی (أم سلمة) کرد، ئەوەبوو ڕۆژێکیان (عمار) پێش هاتنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەچێت بۆ لای (أمِّ سَلمَة) منالەکە لە باوەشی دەردێنێ‌و پێی دەڵێ: واز لەم سووری ناشیرینە بێنە، کە ئازاری پێغەمبەری خوات صلی الله علیه وسلم پێداوە، ئینجا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە دێتەوە، چاوی بەماڵەکەدا دەگێڕاو دەیفەرموو: (أین زناب ؟ ما فعلت زناب) ؟

کوا زناب ؟ چیکرد زناب ؟ وتی: (عمار) هات‌و بردی، ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گواستیەوە.

پاشان سێ شەو لەلای مایەوەو فەرمووی: {إِنَّهُ لَيْسَ بِكِ عَلَى أَهْلِكِ هَوَانٌ إِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ لَكِ وَإِنْ سَبَّعْتُ لَكِ سَبَّعْتُ لِنِسَائِي}[1]، تۆ لای مێردەکەت کەم نرخ نیت، ئەگەر دەتەوێ بۆت دەکەم بە حەوت شەو، ئەگەر بۆ تۆم کرد بە حەوت شەو بۆ ژنەکانی تریش دەیکەم بە حەوت.

تێبینی: (إبن کثیر) ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: (سلمة)ی کوڕە گەورەی (أم سلمة) دایکی مارەکرد لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، هەندێ لە زانایان بەهەڵەدا چوون کە دەڵێن (عمر)ی کوڕی بووە، چونکە ئەو مناڵ بووەو شایستەی ئەم کارە نەبووە[2].

---

١) رواه مسلم: (٢٦٥٠) .

٢) بڕوانە: البداية والنهاية: (١٠٤/٤) .

## بابەتێكی فیقهی :

بەتێكڕای دەنگی زانایان كوڕ دەتوانێ ببێتە سەرپەرشتیاری دایكی لەكاتی مارەبڕینیدا، ئەگەر:

❀ پەیوەندیەكی خزمایەتی لەگەڵدا هەبێت، وەك (سلمة) كە باوكی ئامۆزای دایكێتی.

❀ كوڕەكە دادوەر (حاكم) بێت.

بەڵام ئەگەر تەنها كوڕی بێت لەلای پێشەوا (شافعي) ڕەحمەتی خوای لێبێت دروست نیەو، لای هەر سێ پێشەوا (أبو حنيفة و مالك و أحمد) ڕەحمەتی خوایان لێبێت دروستە[1].

## پلەو پایەو سەروەرییەكانی

١- (أمُ سَلمَة) (جبريل) لە شێوەی (دِحيَةُ الكلبيَ)دا دەبینێ:- {قالَ سلمانَ: أنبئتُ أنَّ جبْرِيلَ عليْهِ السَّلام أتى نَبيَّ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَعِندَهُ أمُّ سَلمَةَ قالَ فجَعَلَ يَتحَدَّثُ ثمَّ قامَ فقالَ نَبيُّ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لِأمِّ سَلمَةَ مَنْ هَذا أوْ كمَا قالَ قالَتْ هَذا دِحيَةُ قالَ فقالَتْ أمُّ سَلمَةَ ايمُ اللَّهِ مَا حَسِبْتهُ إِلَّا إِيَّاهُ حَتَّى سَمِعْتُ خُطبَةَ نَبيِّ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يُخبِرُ خبَرَنَا[2]}، واتە: (سلمان) دەڵێ: هەواڵم پێدراوە، كە (جبريل) هاتوەتە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، لەكاتێكدا (أمُّ سَلمَة)ی لابوو، قسەی لەگەڵ كردوەو پاشان هەستا، پێغەمبەری خوا

---

١) سەرچاوەی پێشوو.

٢) رواه مسلم: ٤٤٨٩ .

صلى الله عليه وسلم بە (أمُ سَلَمَة)ى فەرموو: {ئەوە كێ بوو ؟، وتی: (دِحيَةُ الكلبيَ) بوو، (راوی فەرموودەكە) دەڵێ: (أمُ سَلَمَة)، وتی: سوێند بە خوا جگە لە ئەو بە كەسیكە تێنەگەشتم، هەتا گوێم لە وتارەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بو ئەم هەواڵەی گێڕایەوە}.

٢- (أمُ سَلَمَة) ئافرەتێكی ژیرو داناوبوو:- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی (٦ك) كۆچیدا خۆی و(أمُ سَلَمَة)ی خێزانی و(١٤٠٠ - ١٥٠٠) كەس لە هاوەڵانی بەرەو (مكة) دەكەونە ڕێ بەمەبەستی جێبەجێكردنی عومرە، كاتێك دەگاتە (ذي الحليفة) بەرگی ئیحرام دەپۆشێت، بەڵام (قريش) ڕێگەی ئەنجامدانی (عُمرة)ی پێنادەن، لە ئەنجامدا پەیمانی (حُديبية) لەنێوان هەردوولادا ئیمزا دەكرێت، لە یەكێك لە خاڵەكانی ئەو ڕێكەوتننامەیەدا هاتووە، كە موسڵمانان ئەمساڵ نەچنە ناو (مكة)، بەڵام ساڵی داهاتوو بۆیان هەیە تا (٣) ڕۆژ لەناو (مكة)دا بمێننەوە، جا كاتێك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نووسینی پەیمانەكە بووەوە، فەرمووی بە هاوەڵانی: (قُومُوا فانحَرُوا ثمَّ احلِقُوا)، واتە: (هەستن قوربانی بكەنو پاشان سەرتان بتاشن)، بەڵام كەس هەڵناسا، سێ جار ئەم قسەیە دووبارە دەكاتەوە بەڵام هەر هەڵناسن، كە كەس هەڵنەسا ئەنجا ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای (أمُ سَلَمَة)و بۆی باسكرد كە لەو خەڵكەوە چی پێگەشتووە، (أمُ سَلَمَة) وتی: {يا نَبيَّ اللهِ صلى الله عليه وسلم أتحِبُّ ذَلِكَ اخرُج ثمَّ لا تكَلِّمْ أحَدًا مِنهُمْ كَلِمَةً حَتَى تَنحَرَ بُدنَكَ وَتدعُوَ حَالِقَكَ فيَحلِقَكَ}، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم حەزدەكەی ئەو كارە ئەنجامدەن؟ بچۆ دەرەوەو لەگەڵ كەسیان قسە مەكە تا قوربانیەكەی خۆت سەردەبڕیت، ئینجا سەرتاشەكەت بانگ بكە، با سەرت بۆ بتاشێ.

(أمُ سَلمَة) دەڵێ: {فخَرَجَ فلَمْ يُكلِّمْ أحَدًا مِنهُمْ حَتّى فعَلَ ذلِكَ نَحَرَ بُدْنَهُ وَدَعَا حَالِقَهُ فحَلقَهُ فلمَّا رَأوْا ذلِكَ قامُوا فنَحَرُوا وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَحْلِقُ بَعْضًا حَتّى كَادَ بَعْضُهُمْ يَقتُلُ بَعْضًا غَمًّا[1]، واتە: چووە دەرەوە قسەی لەگەڵ کەسیان نەکرد تا ئەو کارەی کرد، قوربانیەکەی کردو سەرتاشەکەی بانگکرد سەری تاشی، کاتێك ئەوەیان بینی هەموویان هەستان قوربانییان کردو دەستیان کرد بە تاشینی سەری یەکتری، خەریکبوو لە داخو پەژارەدا یەکتر بکوژن.

٣- لە ماڵی (أمُ سَلمَة)دا ئایەت دێتە خوارەوە:- {تذكر أمُ سَلمَة أنَّ النّبيَّ صلى الله عليه وسلم كَانَ فِي بَيْتِهَا فأتَتْهُ فاطِمَةُ ببُرْمَةٍ فِيهَا خَزِيرَةٌ فدَخَلتْ بِهَا عَلَيْهِ فقَالَ لَهَا ادْعِي زَوْجَكِ وَابْنَيْكِ قالَتْ فجَاءَ عَلِيٌّ وَالحُسَيْنُ وَالحَسَنُ فدَخَلوا عَلَيْهِ فجَلسُوا يَأكُلونَ مِنْ تِلكَ الخَزِيرَةِ وَهُوَ عَلى مَنَامَةٍ لهُ عَلى دُكَّانٍ تحْتَهُ كِسَاءٌ لهُ خَيْبَرِيٌّ قالَتْ وَأنَا أصَلِّي فِي الحُجْرَةِ فأنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ هَذِهِ الآيَةَ : ﴿... إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾ الأحزاب، قالَتْ فأخَذَ فضْلَ الكِسَاءِ فغَشّاهُمْ بهِ ثمَّ أخْرَجَ يَدَهُ فألوَى بهَا إِلى السَّمَاءِ ثمَّ قالَ اللهُمَّ هَؤُلاءِ أهْلُ بَيْتِي وَخَاصَّتِي فأذْهِبْ عَنْهُمْ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تطْهِيرًا اللهُمَّ هَؤُلاءِ أهْلُ بَيْتِي وَخَاصَّتِي فأذْهِبْ عَنْهُمْ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تطْهِيرًا قالَتْ فأدْخَلْتُ رَأسِي البَيْتَ فقُلْتُ وَأنَا مَعَكُمْ يَا رَسُولَ اللهِ قالَ إِنّكِ إِلى خَيْرٍ إِنّكِ إِلى خَيْرٍ}[2]، واتە: أمُ سَلمَة دەڵێ: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە ماڵی مندابوو، (فاطِمَة) مەنجەڵێکی

---

١) رواه البخاري: ٢٥٢٩ .

٢) رواه أحمد: (٢٦٥٥١)، وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح .

بۆ هێنا (خزیرَة)[1]ی تێدابوو، فەرمووی برۆ مێردەکەتو دوو کوڕەکەت بانگ بکە، (أمّ سلَمَة) دەڵێ (علي و حَسَین و حَسَن) هاتنە ژوورەوە بۆ لای، ئەنجا دانیشتنو دەستیان کرد بە خواردنی (خَزِیرَة)ەکە، پێغەمبەریش صلی الله علیە وسلم لە شوێنی نوستنیدا بوو کە سەکۆیەك بوو بەرگێکی (خَیبَرِيّ) لەژێردابوو، منیش لە ژوورەکەمدا نوێژم دەکرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، ﴿... إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴿٣٣﴾﴾ الأحزاب، واتە: بەڕاستی خوا دەیەوێ چڵكو پیسی لە ئێوە دوورخاتەوەو بە پاكو پوختی بتانهێڵێتەوە ئەی کەسوکاری پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، ئەنجا بە سووچێکی بەرگەکە دایپۆشینو پاشان دەستی هێنایە دەرەوەو بەرزی کردەوە بەرەو ئاسمانو فەرمووی: {خوایە ئەمانە (أهْلُ البیْت)و هەڵبژاردەی منن، چڵكو پەڵەیان لێ دوورخەرەوەو، پاكو پوختیان کەرەوە، خوایە ئەمانە (أهْلُ البیْت)و هەڵبژاردەی منن، چڵكو پەڵەیان لێ دوورخەرەوەو، پاكو پوختیان کەرەوە}.

(أمّ سَلَمَة) دەڵێ: منیش سەرم هێنایە ماڵەوەو، وتم: منیش لەگەڵتانم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، فەرمووی: تۆ بەرەو چاکە دەچی تۆ بەرەو چاکە دەچی).

٤- (أمّ سلمة) خەمخۆری پێغەمبەر بووە صلی الله علیە وسلم:- {عن سفینه قال: کنت عبداً مملوکا لأم سلمة فقالت: أعتقك وأشترط علیك أن تخدم رسول الله صلی الله علیه وسلم فقلت: إن لم تشترطي علي ما

١) (خزیرة)، گۆشتی وردکراوە، کوڵێنراوە لە مەنجەڵێك ئاوداو، پاشان کەمێك ئاردی پیاکراوەو خوراوە.

فارقت رسول الله صلى الله عليه وسلم ما عشت، فأعتقني واشترطت عليّ}، (سفينة) دەڵێ: من كۆیلەی (أم سلمة) بووم، وتی: ئازادت دەكەم بەو مەرجەی تاماوی خزمەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بكەی، منیش وتم: ئەگەر ئەو مەرجەشم لەسەر دانەنێیت من تاماوم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەجێناهێڵم، ئەنجا ئازادی كردم‌و مەرجیشی لەسەر دانام.

٥- (أمّ سلمة) دوعایەكی گرنگ لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕێتەوە:- {قال شهر بن حوشب: قلت لأم سلمة: يا أمّ المؤمنين ما كان أكثر دعاء رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا كان عندك ؟ قالت: كان أكثر دعائه: يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك. قالت: فقلت: يا رسول الله ما لأكثرَ دعائك يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك ؟ قال: يا أم سلمة إنه ليس آدمي إلا وقلبه بين أصبعين من أصابع الله، فمن شاء أقام، ومن شاء أزاغ، فتلا معاذ: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا ... ﴿٨﴾ ﴾ آل عمران}[1]، واتە: (شەهر)ی كوڕی (حوشب) دەڵێ: وتم بە (أمّ سلمة): ئەی دایكی ئیمانداران ئەو كاتانەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لای تۆ بوو، زۆرترین دوعای چی بوو ؟ وتی: زۆرترین دوعای: (ئەی ئەو كەسەی دڵەكان ئەمدیودیو پێ دەكەی، دڵم لەسەر دینەكەت جێگیرو دامەزراو بكە)، (أمّ سلمة) دەڵێ: منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هۆی چیە زۆر ئەم دوعایە دەڵێیتەوە ؟ فەرمووی: (ئەی (أمّ سلمة) هیچ مرۆڤێك نیە دڵی لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەكانی خوای گەورەدا نەبێت، بۆ هەركەسێك ویستی

١) صحيح جامع الترمذي للألباني: (٢٧٩٢).

هەبوو ڕایدەگرێو بۆ هەرکەسێکیش ویستی هەبوو دەیگۆڕێ)، پاشان (مُعاذ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ پەروەردگارمان دڵەکانمان لامەدە پاش ئەوەی ڕێت نیشان داوین﴾.

٦- (أمُ سلمة) یارمەتیدەری هەژاران بووە:- {عن أياس عن أم الحسين أنها كانت عند أم سلمة فأتى مساكين فجعلوا يلحون وفيهم نساء فقلت: أخرجوا أو اخرجن فقالت أم سلمة: ما بهذا أمرنا يا جارية ردي كل واحد و واحدة، ولو بتمرةٍ تضعيها في يدها[1]، واتە: إیاس لە (أم الحسين)ەوە دەگێڕێتەوە، کاتێك لای (أمُ سلمة) بووە، چەند هەژارێك هاتن‌و داوای یارمەتییان کرد، ئافرەتیشیان تێدابوو، وتم: بڕۆنە دەرەوە! (أمُ سلمة) وتی: کچەکە بەم شێوەیە فەرمانمان پێنەکراوە، یەك یەك بانگیان بکەرەوە، تەنانەت ئەگەر دەنکە خورمایەکیشت خستبێتە ناو دەستیان.

٧- (أم سلمة) خوێندەوار بووە:- عن ابن عبدالرحمن أن أم سلمة أخبرته: أنها لما قدمت المدينة أخبرتهم: أنها بنت أبي أمية، فكذبوها، حتى أنشأ ناس منهم الحج، فقالوا: أتكتبين إلى اهلك ؟ فكتبت معهم، فرجعوا، فصدقوها، وازدادت عليهم كرامة[2]، واتە: عبدالرحمن دەڵێ (أم سلمة) بۆی گێڕاومەتەوە کاتێك چوومەتە (مدينة)و وتویەتی من کچی (أبو أميّة)م، ئەوانیش (خەڵکی مەدینە) باوەڕیان پێنەکرد، تا کۆمەڵێك خەڵك دەیان ویست بچن بۆ حەجکردن، دەڵێن بە (أم سلمة)، نامە دەنووسی بۆ کەسوکارت ؟ ئەویش نامەیەك دەنووسێ، کاتێك دەگەڕێنەوە باوەڕی پێدەکەن‌و، بەڕێزتر دەبێ لەلایان.

---

١) رواه ابن عبد البر في الإستيعاب (٢/ ١٢٩) .
٢) رواه ابن سعد في الطبقات: (٨/ ٩٣،٩٤)، وصحح إسناده الأرناؤوط في سير اعلام النبلاء: (٢/٢٠٦).

٨- (أم سلمة) لـێبورده بوو:- {عَنْ أبي المُتوكّلِ عَنْ أمّ سَلمَةَ أنّها أتتْ بطَعامٍ في صَحْفَةٍ لَهَا إلَى رَسُولِ اللّهِ صلى الله عليه وسلم وأصْحَابِهِ فجَاءَتْ عَائِشَةُ مُتَزِرةً بِكِسَاءٍ وَمَعَهَا فِهْرٌ فَفَلَقَتْ بِهِ الصَّحْفَةَ فَجَمَعَ النّبِيُّ صلى الله عليه وسلم بَيْنَ فِلْقَتَيْ الصَّحْفَةِ وَيَقُولُ كُلُوا غَارَتْ أمُّكُمْ مَرّتَيْنِ ثُمّ أخَذَ رَسُولُ اللّهِ صلى الله عليه وسلم صَحْفَةَ عَائِشَةَ فَبَعَثَ بِهَا إلَى أمّ سَلمَةَ وَأعْطَى صَحْفَةَ أمّ سَلمَةَ عَائِشَةَ}[١]، واته: جارێكیان (أم سلمة) له قاپێكدا خواردن بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلمو هاوه‌ڵانی دێنێت (واته: بۆ ماڵی (عائشة)، (عائشة) هات - له كاتێكدا پۆشاكێكی له‌خۆی پێچابوو به‌ردێكیشی پێ بوو- به به‌رده‌كه قاپه‌كه ده‌كا به دوو كه‌رته‌وه، ئینجا پێغه‌مبه‌ریش صلى الله عليه وسلم هه‌ردوو له‌ته قاپه‌كه به خواردنه‌كه‌وه به‌رز ده‌كاته‌وه‌و، ده‌یخاته به‌رده‌ست هاوه‌ڵانیو دووجار ده‌فه‌رموێت: بخۆن دایكتان غیره‌ت گرتی، پاشان پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم قاپێكی (عائشة) ده‌نێرێت بۆ (أم سلمة)و، دووله‌ته قاپه‌كه‌ی (أم سلمة)ش ده‌دات به (عائشة).

٩- (أم سلمة) (حُسَين)ی زۆر خۆشویستووه:- {عن شهر بن حوشب قال أنا لعند أم سلمة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قال فسمعت صارخة فأقبلت حتى انتهت إلى أم سلمة فقالت: قتل الحسين! قالت: قد فعلوها ملأ الله بيوتهم عليهم ناراً و وقعت مغشياً عليها وقمنا}[٢]، واته: (شهر)ی كوڕی (حوشب) وتی: لای (أم سلمة)ی خێزانی پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم بووین، ژنێك به هاواره‌وه هات

١) رواه النسائي: ٣٨٩٤، وصححه الألباني في إرواء الغليل: (٥/ ٣٦٠).
٢) رواه ابن سعد، قاله أبن حجر العسقلاني في تهذيب التهذيب: (٢/٣٠٦-٣٠٧).

تـا گەشــتە لای (أم ســـلمة) ئینجـا وتــی: (حُـسَین) کــوژرا، (أم ســلمة)ش وتـی: ئەو کارەیان کرد خوا ماڵەکانیان بەسـەریاندا پڕکـا لـە ئـاگر، پاشـان کەوتو بورایــەوە، ئێمەش هاتینــە دەرەوە.

## کـۆچـی دوایـــی

لـە سـاڵی (٦١)ی کۆچـی لـە تەمـەنی (٩٠) سـاڵیدا لـە (مدینـة) کۆچـی دوایـی دەکـاتو هـەردوو کوڕەکـەی (عمـر و سلمة)و چـەند کەسێکی تـر لـە خزمـانی گۆڕیـان بـۆ ئامـادە کـردو لـە گۆڕسـتانی (البقیـع) ناشــتیان، دوایـین خێزانـی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم کۆچی دوایی کردبێت.

## ژمارەی ئەو فەرموودانـەی گێڕاوێتـیەوە:

(٣٧٨) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیـە وسلم گێڕاوەتـەوە: متفـق علیە (١٣) فەرموودە، البخـاري (٣) فەرموودە، مسـلم (١٣) فەرموودە.

# جوەيريەى كچى حارس خواى لـێ ڕازى بێت (١)

نـاوى: (جويريـة)ى كـچى (الحـارث)ى كـوڕى (عائـذ)ى كـوڕى (مالـك) كـوڕى (جنيمـة)يه.

خێزانـى (مـسافع)ى كـوڕى (صـفوان)ى (الـمـصطـلقي) بـووه، لـه شـەڕى (الـمريـسيع)دا دەكوژرێ.

ئەم شەڕە له ساڵى (٦)ى كۆچيدا ڕوويدا، كاتێك هەواڵ گەيشت به پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كه گەورەى خێڵى (بنـي الـمصطلق) (حارث)ى كوڕى (أبي ضرار) خۆىو خێڵەكەى ئامـادەكردووه بـۆ شـەڕكردن لەگـەڵ پێغەمبـەرى خـوا صلى الله عليه وسلم، پـاش ئـەوەى لـه ڕاسـتى هەواڵـه كـه دڵنيـا بـوو، هـاوەڵانى كۆكردەوەو بـەخێرايى بۆيـان دەرچـوو، كـه گەيـشتە ناوچـەى (الـمريـسيع)(٢)، شـەڕ دەسـتى پێكـرد، لـه ئەنجامـدا بێبـاوەڕان شكـستيان هێنـا، ئـەوەى كـوژرا كـوژراو ژنو منداڵو سامانو وشتـرو مەڕو ماڵاتيـان كەوتە دەست موسـڵمانان، وه يەكێك له به كۆيلـەكراوەكـان (جويرية)ى كچـى (الحـارث) بوو.

## خوازبێنـى كردنـى (جويـريـة) له سـاڵى (٦)ى كـۆچى

عن عائشة قالت: لـما قسـم رسول الله صلى الله عليـه وسـلم وسـلم سـبايا بـني الـمصطلق، وقعت جوريرة بنت الحـارث فـي السهم لثابت بن قيس بن شـماس، أو لابن عـم له، فكـاتبته على نفسها، وكانت امـرأة حلـوة ملاحـة، لا يراهـا أحـد

---

١) الإصابة: (٣/٤٦٠)، الإستيعاب: (٢/٨٢)، سير أعلام النبلاء: (٢/٢٦٢)، البداية والنهاية: (٤/١٨١-١٨٢)، الأعلام للزركلي: (٢/٢٤٨).

٢) ناوى ئاوێكه له ئاوەكانى ناوچەى (بنـي الـمصطلق).

إلا أخذت بنفسه، فأتت رسول الله صلى الله عليه وسلم لتستعينه في كتابتها قالت: فوالله ما هو إلا أن رأيتها على باب حجرتي فكرهتها، وعرفت أنه سيرى منها ما رأيت.

فدخلت عليه فقالت: يا رسول الله أنا جويرية بنت الحارث بن أبي ضرار سيد قومه، وقد أصابني من البلاء ما لم يخف عليك، فوقعت في السهم لثابت بن قيس بن شماس، أو لابن عم له، فكاتبته على نفسي فجئتك أستعينك على كتابتي.

قال: فهل لك في خير من ذلك ؟

قالت: وما هو يا رسول الله ؟

قال: أقضي عنك كتابك وأتزوجك .

قالت: نعم يا رسول الله قد فعلت.

قالت: وخرج الخبر إلى الناس أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قد تزوج جويرية بنت الحارث.

فقال الناس: أصهار رسول الله صلى الله عليه وسلم فأرسلوا ما بأيديهم قالت: فلقد أعتق بتزويجه إياها مائة أهل بيت من بني المصطلق، فما أعلم امرأة أعظم بركة على قومها منها[١].

واته: (عائيشه) دەڵێت: كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كەنیزەكەكانی دابەش كرد، (جويرية)ی كچی (الحارث) كەوتە پشكی (ثابت)ی كوڕی (قيس)ی كوڕی (شماس)، یان ئامۆزاكەی، (جويرية)ش خۆی (مكاتبة)[٢] كرد لە (ثابت)، ئافرەتێكی جوان بوو، هەركەسێك بیدیایە سەرنجی ڕادەكێشا، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوەی لە ڕزگاربوونی لەو

١) صحيح مرسل: قاله الألباني في إرواء الغليل: رقم (١٢١٢)، وشعيب الأرناؤوط في تحقيقه لسير أعلام النبلاء: (٢/٢٦٢).

٢) واته: بوویە كۆیلە، بەڵام هەركاتێك توانای هەبێ خۆی دەكڕێتەوەو ئازاد دەبێ.

(مكاتبة)يه هاوكارى بكا، سوێند به خوا كه لەبەردەم دەرگاى حوجرەكەمدا بينيم خۆشمنەويست، چونكه زانيم ئەوە دەبينىٚ له (جويرية) كه من بينيم.

هاته ژوورەوە بۆلاى، وتى ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم: من (جويرية)ى كچى (الحارث)ى كوڕى (أبي ضرار)م، گەورەى هۆزەكەى، تووشى گرفتێك بووم كه لات شاراوە نيه، كەوتومەتە پشكى (ثابت)ى كوڕى (قيس)ى كوڕى (شماس)، خۆم (مكاتبة)ى ئەو كردووە، هاتووم داواى يارمەتيت لێدەكەم بۆ ئەو (مكاتبة)يه.

فەرمووى: ئەى لەوە باشترت ناوىٚ ؟

وتى: كامەيه ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم ؟

فەرمووى: پارەى (مكاتبة)كەت دەدەمو دەتكەمه خێزانم.

وتى: بەڵىٚ ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم ڕازيم.

(عائشة) دەڵىٚ: هەواڵ گەيشته خەڵكى كه پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم (جويرية)ى كچى (الحارث)ى كردۆته خێزانى خۆى.

وتيان: خزمانى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم! ئەوەى كۆيله بوو به دەستيانەوە ئازاديان كرد.

(عائشة) دەڵىٚ: بەهۆى ئەم خوازبێنيەوە سەد كەس له (بني المصطلق) ئازاد كرا، هيچ ئافرەتێك شك نابەم ئەوەندە خێرو بەرەكەتى هەبووبىٚ بۆ هۆزەكەى.

هەروەها (الشعبي)، دەڵىٚ: {أعتق رسول الله صلى الله عليه وسلم جويرية، واستنكحها، وجعل صداقها عتق كل مملوك من بني المصطلق[١]، واته: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم (جويرية)ى ئازاد كردو مارەى كرد، ئازادكردنى هۆزەكەى بۆ كردە مارەيى.

---

١) إسناده صحيح مرسل: قاله شعيب الأرناؤوط في تحقيقه لسير أعلام النبلاء: (٢٦٢/٢).

## پێغه‌مبـه‌ری خوا صلى الله عليه و سلم ناوی نـا (جويريـة)

{عَنِ ابْنِ عَبَّـاسٍ قَـالَ: كَانَتْ جُوَيْرِيَةُ اسْمُهَا بَرَّةُ فَحَوَّلَ رَسُولُ اللّـهِ صلى الله عليه وسلم اسْمَهَا جُوَيْرِيَةَ وَكَانَ يَكْرَهُ أَنْ يُقَالَ خَرَجَ مِنْ عِنْدَ بَـرَّةَ}[1]، واتـه: (إبن عبـاس) ده‌ڵـێ: (جويريـة) نـاوی (بـرَة) بـوو (واتـه: چاكه)، پێغه‌مبـه‌ری خـوا صلى الله عليه وسلم ناوه‌كه‌ی گۆڕی به (جويريـة)، چونكـه پێـی نـاخۆش بوترێت: له ماڵی چاكـه، واته (جويرية) ڕۆيشـتـه ده‌ره‌وه.

{عن أبي قلابة، قال: أتـى والـد جويريـة، فقـال: إن بنتـي لا يـسبى مثلها، فأنـا أكرم من ذلك، فقال النبـي صلى الله عليه وسلم: أرأيت إن خيـرناها، فأتاها أبوهـا فقـال: إن هـذا الرجـل قـد خيـرك، فـلا تفـضحينا، فقـالت: فـإني قـد اختـرته، قـال: قـد والله فـضحتنا}[2]، (أبـو قلابـة) ده‌ڵـێ: بـاوكی (جويريـة) هـات، وتـی: كه‌سـێكی وه‌ك كـچی مـن چـۆن بـه كۆيلـه ده‌كـرێ، مـن لـه‌وه به‌ڕێزترم، فه‌رمووی: ئه‌ی ئه‌گه‌ر سه‌رپشكمان كرد ؟ باوكی هات بۆ لای، وتـی: ئه‌م پياوه سه‌رپشكی كردووی ئابڕوومان مه‌به، ئه‌ويش وتی: پێغه‌مبـه‌رم صلى الله عليه وسلم هه‌ڵبژاردووه، وتـی: سوێند به خـوا ئابڕووت بردين.

## پلـه‌و پـايه و سـه‌روه‌رييه‌كـانی

١- ڕۆژووگـر بـوو:- {عَنْ أَبي أَيُّـوبَ عَنْ جُوَيْرِيَـة بِنْـتِ الْحَـارِثِ رَضِيَ اللّـهُ عَنْهَـا: أَنَّ النَّبِـيَّ صـلى الله عليـه وسـلم دَخَـلَ عَلَيْهَـا يَـوْمَ الْجُمُعَـةِ وَهِـيَ صَـائِمَةٌ، فَقَالَ أَصُمْتِ أَمْسِ ؟ قَالَـتْ: لا، قَـالَ: تُرِيدِينَ أَنْ تَـصُومِي غَدًا ؟

---

١) رواه مسـلم: (٣٩٨٩).

٢) قـال ابن حجـر فـي تهذيب التهذيب (١٢/٣٥٨): إسـناده صحيح مرسل، وكـذلك الأرنـاؤوط: (٢/٢٦٣).

قالت: لا. قالَ: فأفطِري[1]، واته: له ئه‌بو ئه‌یوبه‌وه ئه‌ویش له (جویریـة)ی كچی (الحارث) ده‌ڵێ: پێغه‌مبـه‌ر صلی الله علیـه وسلم لـه ڕۆژی هه‌ینیـدا ڕۆیـشته‌وه بـۆ لای (جویریــة) لــه كاتێكــدا (جویریــة)، بــه‌ڕۆژوو بــوو فه‌رمووی: دوێنـێ به‌ڕۆژوو بووی ؟ وتی: نه‌خێر، فـه‌رمووی: ئـه‌ی بـه‌یانی به‌ڕۆژوو ده‌بیت ؟ وتی: نه‌خێر، فه‌رمووی: ده‌ی ڕۆژووه‌كه‌ت بشكێنه.

٢- هه‌میشـه خه‌ریكی خواپه‌رستی بوو:- {عن ابـن عبـاس عَـنْ جُوَيْـرِيَةَ: أَنَّ النَّبِـيَّ صلى الله عليه وسلم خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ وَهِـيَ فِي مَسْجِدِهَا ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحَى وَهِـيَ جَالِسَـةٌ، فَقَالَ: مَـا زِلْـتِ عَلَى الْحَالِ الَّتِي فَارَقْتُكِ عَلَيْهَا قَالَتْ نَعَمْ قَالَ النَّبِـيُّ صلى الله عليه وسلم لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلاثَ مَرَّاتٍ لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُـنَّ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ[2]، واته: (جویریة) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیـه وسـلم بـه‌یانی زوو، دوای ئـه‌وه‌ی نوێـژی كـرد، لـه‌لای (جویریـة) چووه ده‌ره‌وه هێـشتا ئـه‌و لـه جـێ نوێژه‌كه‌یدا بوو، له كاتی چێشته‌نگاودا گه‌ڕایه‌وه (جویریة) هه‌ر له‌شوێنی خۆی دانیشتبوو، فه‌رمووی: هێـشتا هـه‌ر له‌سـه‌ر ئـه‌و حــاڵه مـاوی كـه‌من به‌جێمـهێشتی؟ وتی: به‌ڵێ، فه‌رمووی: من له‌دوای تۆ چوار ووشه‌م سێ‌جار دووباره كردەوه، ئه‌گه‌ر بكێشـرێت له‌گـه‌ڵ هه‌موو ئه‌وانـه‌ی كـه تـۆ ئـه‌مرۆ لـه به‌یانیـه‌وه گوتووتـه هاوسـه‌نگی هـه‌موویان ده‌بێـت: پـاكو بێگـه‌ردی‌و سـوپاس‌و سـتایش بـۆ خــوا بــه ئه‌نــدازه ژمــاره‌ی دروســتكراوه‌كانی‌و، ڕه‌زامه‌ندی خۆی‌و، كێشی عه‌رشه‌كه‌ی‌و، مه‌ره‌كه‌بی وشـه‌كانی.

---

١) رواه البخـاري: ١٨٥٠.
٢) مسـلم: ٤٩٠٥.

٣- زۆرجار خواردن لە ماڵیدا نەبووە:- (جُوَيرِيَة) دەڵێت: رۆژێكیان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو فەرمووی: هَلْ مِنْ طَعَامٍ ؟ (هیچ خواردنێك هەیە)؟ وتم: لا إِلَّا عَظْمًا أَعْطِيَتْهُ مَوْلاةٌ لَنَا مِنَ الصَّدَقَةِ قَالَ صلی الله علیه وسلم فَقَرِّبِيهِ فَقَدْ بَلَغَتْ مَحِلَّهَا[1]، واتە: نەخێر ئێسقانێكی خێر نەبێت، كە درابوو بە كەنیزەكێكمان. فەرمووی: بیهێنە گەیشتووەتە شوێنی خۆی.

{لە ڕووداوێكی تری هاوشێوەی ئەمەدا دەفەرموێت: (هو لها صدقة ولنا هدية[2]، واتە: بۆ ئەو (صدقة)یەو بۆ ئێمە خەڵاتە}، چونكە كەنیزەكەكان بەخشیویانە بەخێزانەكانی.

## كۆچی دوایی

لە ساڵی (٥٠)ی كۆچیدا، لە سەردەمی خیلافەتی (معاوية)، لە تەمەنی (٦٥) ساڵیدا لە (مدينة) كۆچی دوایی دەكاتو (مروان)ی كوڕی (الحكم) نوێژی لەسەر دەكاتو لە گۆڕستانی (البقيع) دەنێژرێت.

## ژمارەی ئەو فەرموودانەی گێڕاوێتیەوە

حەوت فەرموودەی گێڕاوەتەوە یەك فەرموودەیان لە (صحيح البخاري)و چواریشیان لە (صحيح مسلم) دایە .

---

١) رواه أحمد: (٢٧٤٦٠ و٢٧٤٦٤) وصححه الأرناؤوط.

٢) البخاري: ١٣٩٨، ومسلم: ١٧٨٦.

# زەینەبی کچی جەحش خوای لێ ڕازی بێت (١)

ناوی: (زینب)ی کچی (جحش)ی کوڕی (رئاب)ی کوڕی (یعمر)ی کوڕی (صبیرة)ی کوڕی (مرة)ی کوڕی (کثیر)ی کوڕی (غنم)ی کوڕی (دودان)ی کوڕی (أسد)ی کوڕی (خزیمة)یە.

دایکی: ناوی (أمیمة)ی کچی (عبد المطلب)ی کوڕی (هاشم)ە، واتە (زینب) کچی پوری پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم.

پێشتر خێزانی (زید)ی کوڕی (حارثة)ی کوڕی (شراحیل)ی (الکعبي) بووە.

## (زید)ی کوڕی (حارثـة) خوای لێ ڕازی بێ، چۆن بوو بە کوڕی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم ؟

(سعدی)ی دایکی (زید) لە سەردەمی نەفامیدا دەچێت بۆ (مکة) بە مەبەستی بەسەرکردنەوەی کەسوکاری، (زید)ی کوڕیشی لەگەڵدا دەبێت، لەکاتی گەشتنیان بۆ (مکة) شەڕێك بەرپا دەبێت لەنێوان خێڵی (بني القي)و (بني معن)دا، خێڵی (بني القي) بە سواری ئەسپەوە دەدەن بەسەر ماڵەکانی خێڵی (بني معن)داو (زید)یش کە لاوێکی تازە پێگەشتووە لەوناوەدا دەبێت دەیرفێنن، دوایی دەیبەنە بازاڕی (عکاظ)و لەوێ بە مەبەستی فرۆشتن دەیخەنەڕوو، لەوێ (حکیم)ی کوڕی (حزام)ی برازای (خدیجة) بە (٤٠٠

١) الإصابة: (١٢/١٦٩- ١٧٢)، الاستیعاب: (٢/٩٧- ٩٨)، سیر أعلام النبلاء: (٢/٢١١- ٢١٨)، أسد الغابة: (٧/١٣٨- ١٤٠)، البدایة والنهایة: (٤/١٦٦- ١٦٩).

درهـەم) دەیکـڕێو پێـشکەشی (خدیجـة)ی دەکـات، ئـەویش دوای بـوونی بـە هاوسەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم پێشکەشی ئەوی دەکات.

پاشـان (حارثـة)ی بـاوکی (زیـد) لەگـەڵ (عمـر و قـیس)ی مـامیو (یزیـد و جبل)ی برای زۆر بەدوایـدا دەگەڕێن بەڵام بێـسوود دەبێت، بـاوکی دامـاوی بـە شیعر خەموپەژارەی خۆی دەردەبڕێ کە دەڵێ:

بكيـتُ علــى زيـدٍ وَ لـم أدرِ مـا فعــلْ
أحـيٌّ فيُرجـى أم أتـي دونــه الأجـــلْ
أوصـي بـه عمـراً وقيسـاً كـلاهمـــا
و أوصـي يزيـــداً ثـم بعدهـم جبَـــلْ

دوای ئەوە چەند کەسێك لە خێڵی (کلـب) دێن بۆ حەجکـردن لـەوێ (زید) دەبیننـەوەو یەکتـر دەناسـنەوە، لەکـاتی گـەڕانەوەیاندا پێیـان دەڵـێ ئـەم چەند دێڕە شیعرە بگەیەننە کەسوکـارم:

أحــنّ إلـــي قومـي وإن كنـت نائيـــاً
بـأني قطـين البيـت عند المشـاعـر
فكـفـوا من الوجـد الـذي قد شجاكـم
ولا تعملـوا فـي الأرض نـص الأباعــر
فـإني بحمـد الله فـي خيـر أســرة
كـرام معـد كـابـراً بعـد كـابــر

ئـەوانیش دەگەڕێنـەوەو بـە بـاوکی دەڵـێن: کوڕەکـەت بـە کۆیلـە کـراوەو فرۆشراوەو ئێستا لای کەسێکە بە ناوی محمد صلی الله علیە وسلم.

ئینجا (حارثـة)ی بـاوکیو (کعـب)ی مـامی چوون بـۆ (مکـة)، لـەویٚ هـەواڵی پێغەمبەریان صلی الله علیـه وسلم پرسـی، وتیـان: لـه (کعبـة)یـه، چوونه لایو پێیان گوت: ئەی کوڕی (عبد المطلب)، ئـەی کـوڕی گـەورەی خێڵەکـەی خـۆی، ئێـوه خـەڵکی حـەرەمی خـوان، ئێـوه گیــراو ئـازاد دەکـەنو خـواردن بـه دیـل دەدەن، ئێمه هـاتووینەته لات بۆ کوڕەکـەمان (کۆیلەکـەت)، ئـەم پیاوەتیـەمــان لەگـەڵدا بکـەو بە چاکـه ئازادی بکـه، چیـت دەویٚ دەیخـەینه خزمەتت.

فەرمووی: {وما ذاك}؟ واتە: کـوڕی ئێوه کـیٚ یه ؟

وتیان: (زیـد)ی کـوڕی (حارثة).

فەرمووی: {وغیـر ذلك، ادعوه فخیـروه فإن اختارکـم فهـو لکم بغیـر فـداء وإن اختـارني فوالله مـا أنـا بالـذي أختـار علـی مـن اختـارني فـداء}، واتـه: هەرچی بێت، بـانگی بکـەنو سـەرپـشکی بکـەن، ئەگـەر ئێوەی هەڵبـژارد، ئـەوا بەبیٚ (فدیـة) بیبەنەوەو، ئەگـەر منیـشی هەڵبـژارد، سـوێند بـه خـوا کەسـێك من هەڵبژێریٚ به هیچ شـتێك دەسـتبەرداری نـابم.

وتیــان: بەڕاستی دادپـەروەری لەگەڵمــان.

ئینجا بە(زید)ی فەرمووی: {هل تعـرف هـؤلاء}؟، واته: ئەوانه دەناسی ؟

وتی: بەڵـیٚ، ئەوە باوکمـەو ئەویش مامـمـه.

فـەرمووی: {فأنــا مــن قــد علمــت وقــد رأیــت صــحبتي لــك فاختــرني أو اختــرهما}، واته: منیشت ناسیوەو دەزانی هەڵسوکەوتم چۆنه، کەواتـه یـا مـن هەڵبژێره، یا ئەو دوانــه.

وتی: من هیچ کەسێك بەسەرتۆدا هەڵنابژێرم، تـۆ بـۆمن لـه جێگـەی بـاوكو مامــدای.

وتیان: تیاچیت، ژیانی کۆیلەیی هەڵدەبژێری بەسەر ژیانی ئازادیو باوكو مامو كەسوكاردا.

وتی: بەڵێ، بەڕاستی من شتێکم لەم پیاوە بەدیکردووە، کە ناتوانم هیچ کەسێکی بەسەردا هەڵبژێرم.

کاتێك پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم ئەم هەڵوێستەی لێبینی، (زید)ی بردە لای بەردەڕەشەکەی (کعبة)و فەرمووی: {اشهدوا أنّ زیداً ابني یرثني وأرثه}، واتە: ئێوە شایەت بن کە (زید) کوڕی منەو میراتم لێدەباتو میراتی لێدەبەم.

کاتێك باوكو مامی ئەمەیان بینی خۆشحاڵبوونو گەڕانەوە.

ئیتر لەو ڕۆژەوە بە (زید)ی کوڕی (محمد) ناودەبرا تاوەکو ئیسلام هات[1].

دواتر پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم (أم أیمن)ی بۆ خوازبێنی دەکاتو (أسامة)ی لێدەبێت، دوایی تەڵاقی دەداو پاشان پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم (زینب)ی کچی (جحش)ی پورزای خۆی بۆ خوازبێنی دەکات.

(زینب) بۆ ماوەی ساڵێك لای (زید) دەمێنێتەوە، پاشان کێشە دەکەوێتە نێوانیانو (زید) دێت بۆ لای پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم سکاڵای خۆی دەکات، خوای پەروەردگاریش (جلّ جلاله) ئەم بەسەرهاتەمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە:

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ ...﴿٣٧﴾ ﴾ الأحزاب، ئەی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم کاتێك بەو کەسەی (زید)، کە خوا چاکەی لەگەڵ کرد بە هێنانی بەرەو ئیسلام، تۆش چاکەت لەگەڵ کرد بە پەروەردەکردنیو ئازادکردنی لە کۆیلایەتی دەتگوت: ﴿ ... أَمْسِكْ عَلَيْكَ

---

١) بڕوانە: الإصابة: (٤/ ٣٧- ٣٨)، أسد الغابة: (٢/٣٣٦- ٣٣٧)، الإستیعاب: ( ١/١٦٢).

﴿زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ ...﴾ ژنــى خۆت ڕاگــرەو تــەلاقى مــەدەو لــە خــوا بتــرســە ﴿...وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ ...﴾ شتێك لە دەروونتدا دەشاریتەوە كە خــوا ئاشــكراى دەكــات، خــواى گــەورە پێغەمبــەرى صــلى الله عليــه وســلم ئاگاداركردبۆوە، كە (زيــد)، (زينــب) تەلاقــدەداو تــۆش دەبــێ مــارەى بكەى ﴿...وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ...﴾ لە قــسەى دووڕووەكان دەترسى كە بڵێن پێغەمبــەر صلى الله عليــه وسلم ژنى كوڕەكەى خۆى مارە كــردووە، (چونكە لاى ئــەوان ژنـــى بەكوڕكــراو حــەرام بــوو مــارە بكرێــت)، ﴿... فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ۝٣٧﴾ الأحــزاب، كاتێــك (زيــد) بڕياريــدا كــە تەلاقى بدا، ئێمە لە تۆمــان مــارە كــرد.

## خــوازبێنــى كــردنى (زينــب)

(أنــس) دەڵێ: كاتێــك زينــب (عِــدَة)ى تــەواو بــوو پێغەمبــەرى خــوا صلى الله عليــه وسلم بــە (زيــد)ى فــەرموو: {أذكــرها علــيَّ}، واتــە: بــچۆ (زينــب)م بــۆ خوازبێنى بكە، ئــەويش ڕۆشــت بــۆ لاى (زينــب)، بينــى هــەوير دەشێلــێ، دەڵێ: كاتێك كــە بينــيم ئەوەنــدە بــەڕێزو گــەورە هاتــە پێشــچاوم نــەمتوانى ســەيرى بكــەم، چونكە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليــه وسلم خــوازبێنى دەكــات، پــشتم لێكردو، وتــم ئەى (زينب) پێغەمبەرى خوا صلى الله عليــه وســلم نــاردوومى بــۆ خوازبێنــيت، ئــەويش گــوتى: هــيچ بڕيارێــك نــادەم، تــاوەكو نوێــژى (إســتخارة) نەكــەم، ئينجا هەستا نوێژى كــردو، قورئــان هاتــە خــوارەوە، ئينجا پێغەمبــەرى خوا صلى الله عليه وسلم ڕۆيشــتە لاى بەبێ مارەبڕيــن[1].

---

١) رواه مســلم: (٢٥٦٧).

## نــانــى شــايــى

{(ثابت) دەڵێ: لەلاى (أنس) باسى شووكردنى (زينب)ى كچى (جحش) كـرا، وتى: مَا رَأيتُ النَّبيَّ صلى الله عليـه وسـلم أوْلَمَ عَلَى أحَدٍ مِنْ نِسَـائِهِ مَـا أوْلَمَ عَلَيْهَا أوْلَـمَ بشَـاةٍ}[١]، واتە: نەمبينى پێغەمبـەرى خوا صلى الله عليه وسلم بـۆ هيچ ژنێكى بەئەندازەى (زينب) نانى شايى ئامادە بكات، مەڕێكى سەربڕى.

هەروەها دەڵێت: پێغەمبـەرى خـوا صـلى الله عليـه وسـلم ژنـى گواسـتەوە (أمُّ سُلَيم)ى دايكم حەڵواى دروستكردو كرديە قازانێكى گەورەى مسەوەو پێى وتم: ئەى (أنس) ئەمە ببە بۆ پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم پێـى بڵێ دايكـم ئەمـەى بـۆ ناردوويـتو سڵاويـشى لێـدەكردىو، دەيگـوت ئەمـە بۆتـۆ لەلايـەن ئێمـەوە، هەرچـەندە شـتێكى كەميـشە، منـيش بـۆم بـردو پێمگـوت، ئـەويش فەرمووى: {ضَعْهُ}، (واتە: داينێ)، پاشان فـەرمووى: {اذْهَبْ فَـادْعُ لِي فُـلانًا وَفُلانًا وَفُلانًا وَمَنْ لَقِـيتَ وَسَـمَّى رِجَـالاً)، واتە: بڕۆ فلانو فلانو فـلانو هـەر كەسێكى تـرت پێگەيـشت بانگيـان بكە، نـاوى چـەند كەسێكيـشى بـرد، منـيش ئەوانەى نـاوى بـردنو هـەر كەسێكى تـريش پێـى گەيـشتم بـانگم كـرد، (ڕاوى فەرموودەكە)، دەڵێ: گوتم بە (أنس) ژمارەيان چەند كەس بوو؟ گوتى: نزيكەى (٣٠٠) كەس، ئينجا پێغەمبەرى خوا صلى الله عليـه وسـلم فـەرمووى: {يَـا أنَـسُ هَـاتِ التَّـوْرَ}، واتـە: ( ئـەى ئەنـەس قـازانەكە بێنـە)، ئينجا خەڵكەكە چوونە ژوورەوە، تـا (صُـفَّة)[٢]و ژوورەكـە پڕبـوو، پاشـان پێغەمبـەرى خـوا صـلى الله عليه وسلم فەرمووى: {لِيَتحَلَّقْ عَشَـرَةٌ عَشَـرَةٌ وَلْيَـأكُلْ كُلُّ إنْسَـانٍ مِمَّا يَلِـيهِ)،

---

١) رواه البخـاري: (٤٧٧٣) و مسـلم: (٢٥٦٨).

٢) جێگـايەكى سەرگيــراو بـووە لـە بەشـى دواوەى مزگەوتــەوە دروسـتكراوە بـۆ نـاوارەو هەندێك لە كۆچـەران.

واتە: {ئادەی (١٠) کەس، (١٠) کەس، ئەڵقە ببەستن و با هەموو کەسێکیش لەبەردەم خۆیەوە بخوات}. ئیتر هەموویان نانیان خوارد، تاوەکو تێر بوون، کۆمەڵێ دەچوونە ژوورەوەو کۆمەڵێ دەهاتنە دەرەوە، هەتا هەموویان تێربوون، ئینجا فەرمووی: {یا أنسُ ارفـعْ}، واتە: قـازانەکە لابـبە منیش لامبرد نەمدەزانی ئەو کاتەی دامنا زۆرتری تێدا بوو، یان ئەوکاتەی هەڵمگرت.

## هـاتنە خـوارەوەی ئـایـەتی حیجاب

هەروەها (أنس) دەڵێ: سێ کەس لە ماڵی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم مانەوەو، دەستیان کرد بە قسەکردن، پێغەمبەری خوایش صلی الله علیه وسلم دانیشتبوو، هاوسەرەکەشی ڕووی کردبووە دیوارەکە، ئەم حاڵەتەش زۆر گران بوو لەسەر دڵی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شەرمیشی دەکرد پێیان بڵێ، هەستا ڕۆیشتە دەرەوەو، ئەوانی لە ماڵەوە بەجێهێشت، منیش لەگەڵیدا ڕۆشتم و، یەك بەیەك گەڕا بەسەر خێزانەکانیداو سەلامی لێکردن و، پاشان کە گەڕایەوە ئەمجارەیان سێ کەسەکە هەڵسابوون، ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتەوەو پەردەکەی دادایەوەو، ڕۆیشتە ژوورەوە، منیش لەودیو دانیشتم.

زۆری پێ نەچوو هاتە دەرەوە، لای من بوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئینجا ڕۆیشتە دەرەوەو بۆ خەڵکەکەی خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن

تُؤْذُواْ رَسُولَ اللَّهِ ... ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحـزاب، إلـى آخـر الآيـة ووَعِـظَ القَـوْمُ بِمَـا وُعِظُـوا بِهِ.

مانای ئایەتەکە بەم شێوەیەیە: ﴿ ئەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە، مەڕۆنـە ماڵەکانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیـە وسـلم، مەگـەر مۆڵەتتان پـێ بـدرێت بـۆ نان خواردنێك، بێ ئـەوەی چاوەڕوانی خواردنەکە بـن تـا پێدەگـا، بـەڵام کاتـێ بانگـکران بـچنە ژوورەوە، کـە نانتـان خـوارد، زوو بـڵاوەی لـێ بکـەن و بـەدیار قسـەو باسـەوە دامەنیشـن، چونکە ئەمجۆرە کارانـەتان پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم ئازار دەدات و شەرمیشتان لـێ دەکات، بەڵام خوا شـەرم لـە حـەق و ڕاستی ناکات، ئەگەر داوای پێویسـتیەکتان لـە ژنـانی پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم کـرد، لـە پـشتی پـەردەوە داوایـان لـێ بکـەن (ئـەم فەرمانـە تایبەتـە بـە خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیـە وسـلم) ئـا بـەو شـێوەیە پاکتـرە بـۆ دڵـی ئێوەو، دڵی ئەوان، بێگومان ئێوە نابێت ئازاری پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم بدەن ... ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، ئیتـر ئەوچەند کەسـە ئامۆژگـاری کران.

## پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم له (بَرّة)وه ناوی دەگۆڕێ بۆ (زینب)

(زَینَـب)ی کـچی (أمُ سَـلَمَة) دەڵـێ: نـاوم (بَـرَّة) بـوو، واتـە: چاکەکـار، پێغەمبـەری خوا صـلی الله علیە وسـلم ناوی نـام (زینـب)، کاتێکـیش (زینـب)ی کچی (جحش) شووی پێکرد، ئەویش ناوی (بَرَّة) بوو ئەویشی ناونا (زینب)[1].

لە ریوایەتێکی تـردا دەفـەرموێت: {لا تزَكّوا أنفُسَكُمْ اللهُ أعلَمُ بِأهـلِ البـرِّ مِنكُمْ}[2]، واتـە: (تەزکیـەی خۆتـان مەکـەن خـوا زانایـە کـە کـێ چاکـە کـارە لەناو ئێوەدا).

---

١) رواه مسـلم: (٣٩٩١).

٢) رواه مسـلم: (٣٩٩٢).

**پلـەو پایـەو تایبەتمەندیەکـانی**

١- گوێـرایـەڵ بـوو:- {قـالـت زَینَـب بنـتِ أبـي سَـلَمَة... دَخَلـتُ عَلَـى زَينَـب بنتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أخُوهَا فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ بِـهِ ثُـمَّ قَالَتْ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَـةٍ غَيْـرَ أنِّي سَمِعْـتُ رَسُـولَ اللَّـهِ صلى الله عليـه وسـلم عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُـولُ لا يَحِـلُّ لامْـرَأَةٍ تُؤْمِـنُ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الآخِـرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّـتٍ فَوْقَ ثَـلاثٍ إِلاّ عَـلَى زَوْجٍ أرْبَعَـةَ أشْـهُرٍ وَعَشْرًا}[1]، واتـە: (زینـب)ی کـچی (أبـو سَـلَمَة) دەڵـێ: چـووم بـۆ لای (زینـب)ی کـچی (جحـش) تـازە براکەی کۆچی دوایی کردبوو، داوای بۆنی کرد بۆنیان بۆ هێنـاو لەخۆیـدا، پاشان وتی: من هیچ پێویستیم بە بۆن نـەبو تـەنها ئـەوە نـەبێ گوێـم لـە پێغەمبـەری خـوا بـوو صلی الله علیـە وسـلم لەسـەر مینبـەر فـەرمووی: (حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ژنێك کە باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هـەبێ، زیـاتر لە سێ ڕۆژ ماتەمینی بگرێت بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کە چوار مـانگو دە ڕۆژە).

٢- (عائشـة) ستایشی دەکـات:- {قالت عائـشةُ: لم أرَ امـرَأةً قَـطُّ خَيْـرًا فِـي الـدِّينِ مِـنْ زَيْنَـبَ وَأتْقَـى لِلَّـهِ وَأصْـدَقَ حَدِيثًـا وَأوْصَـلَ لِلرَّحِـمِ وَأعْظَمَ صَدَقَةً وَأشَـدَّ ابْتِـذَالاً لِنَفْسِـهَا فِي الْعَمَلِ الَّذِي تَـصَدَّقَ بِـهِ وَتَقَـرَّبُ بِـهِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى مَا عَـدَا سَـوْرَةً مِـنْ حِـدَّةٍ كَـانَتْ فِيهَـا تَـسْرِعُ مِنْهَـا الْفَيْئَـةَ}[2]، واتـە: (عائـشة) دەڵـێ: هـیچ ئـافرەتێکم نـەبینیوە بەئەنـدازەی (زینـب) دینـی چـاكو، لـەخواترسو ڕاستگۆ بێـتو سـەردانی کەسوکارو (صَدَقَة) بکاتو زۆر کۆشش بکات لەو شتەی کـە دەیکـرد بەخێـرو خـۆی لـە خـوا

١) البخاري: (١٣٠٢) و مسلم: (٢٧٣١).
٢) رواه مسلم: (٤٤٧٢).

پێ نزیك دەكردەوە، تەنها ئەوە نەبێت، كە تورەیی‌و هەڵچوونێكی تێدا بوو، بەڵام خێرا پەشیمان دەبویەوە.

٣- خۆ پارێز بوو :- لە ڕووداوی (إفك)دا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاری لێدەكات لەوەی كە دەیزانی، یان ئەوەی كە بینیوتە ؟ ئەویش دەڵێ: (يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ إِلاَّ خَيْرًا)[١]، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێ‌و چاوی خۆم دەپارێزم، چاكە نەبێ هیچی ترم نەزانیوە.

٤- هەمیشە هەنگوینی دەدایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم:- {قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلی الله علیه وسلم يَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَيَمْكُثُ عِنْدَهَا فَوَاطَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ عَلَى أَيَّتُنَا دَخَلَ عَلَيْهَا فَلْتَقُلْ لَهُ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ قَالَ لاَ وَلَكِنِّي كُنْتُ أَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَلَنْ أَعُودَ لَهُ وَقَدْ حَلَفْتُ لاَ تُخْبِرِي بِذَلِكَ أَحَدًا[٢]، (عائشة) دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەلای (زینب)ی كچی (جحش) هەنگوینی دەخواردو لەلای دەمایەوە، من و(حفصة) ڕێكەوتین، كە ئەگەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هات بۆ لای هەركاممان پێی بڵێین (مغافیر)ت[٣] خواردووە ؟ بۆنی (مغافیر)ت لێدێت !

ئەوەبوو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چوو بۆ لای یەكێكیان‌و ئەویش ئەوەی پێ وت: پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نەخێر

١) مسلم: (٤٩٧٤).
٢) البخاري: (٤٥٣١).
٣) شیلەیەكی شیرینی بۆن ناخۆشە.

بەڵكو لاى (زينب)ى كچى (جحش) هەنگوينم خواردووە، ئيدى جارێكى تر نايخۆم، ئەوا سوێندم خوارد، بەڵام لاى كەس باسى مەكە!

(چونكە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زۆر ڕقى لە بۆنى ناخۆش بووەو هەميشە خۆى لێ بەدوور گرتووە).

خوێنەرى بەڕێز: لە ڕيوايەتێكى تردا، كە (بخاري و مسلم)[١] دەيگێڕنەوە، كە ئەو ئافرەتەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم هەنگوينى لا خواردووە (حَفْصَة) بووەو، (عَائِشَة) لەگەڵ (سَوْدَة و صَفِيَّة) ڕێك دەكەون، كەوا بڵێن بە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم، بەڵام زانايان دەڵێن: يەكەميان ڕاستترە، چونكە لەگەڵ سياقى ئايەتەكەدا دەگونجێ: ﴿... وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ ... ﴿٤﴾﴾ التحريم، چونكە باس لە دوو كەس دەكات، كە (حفصة و عائشة)ن، هەروەها (عمر)ى كوڕى (الخطاب)يش، لە وەڵامى پرسيارى (إبن عباس)دا، دەڵێ: ئەو دوو خێزانەى بوون، واتە (عَائِشَة و حَفْصَة)[٢].

٥- خوا لە ئاسمان لە پێغەمبەرى صلى الله عليه وسلم مارەى بڕى:-

{قال أنَسُ بن مَالِكٍ: كَانَتْ تفخَرُ عَلَى نِسَاءِ النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم وَكَانَتْ تقُولُ إنَّ اللهَ أنكَحَنِي فِي السَّمَاءِ}[٣]، واتە: (أنس)ى كوڕى (مالك) دەڵێ: (زينب) شانازى دەكرد لاى خێزانەكانى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەيوت: خواى گەورە منى لە ئاسمان مارە بڕى لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.

---

١) رواه البخاري: (٤٧٦٣)، و مسلم: (٢٦٩٥) .

٢) بڕوانە: عون المعبود: (١٠/١٢٥- ١٢٧) .

٣) رواه البخاري: (٦٨٧١) .

٦- بەخشندە بوو:- {قالت عائشة أم المؤمنين قال رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم أسرعُكُنَّ لحاقاً بي أطولكُنَّ يداً قالت فكُنَّ يتطاولنَ أيتهُنَّ أطولُ يداً قالت فكانت أطولنا يداً زينبُ لأنها كانت تعملُ بيدها وتصدقُ}[1]، واتە: (عائشة)ی دایکی ئیمانداران دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەوەتان کە زووتر بەدوای مندا دێت، ئەوەتانە کە دەستی لە هەمووتان درێژترە)، (عائشة) دەڵێ: خێزانەکانی دەستیان درێژ دەکرد تا بزانن کامیان دەستی درێژترە، بەڵام (زینب) دەستی لە هەموومان درێژتر بوو، چونکە بەدەستی خۆی ئیشی دەکردو[2] خێرو چاکەی لێدەکرد.

لە ریوایەتی (بخاري)دا (عائشة) دەڵێ: {إنَّ بعضَ أزواجِ النبيِّ صلى الله عليه وسلم قُلنَ للنبيِّ صلى الله عليه وسلم أيُّنا أسرعُ بكَ لحوقاً ؟ قالَ: (أطولُكُنَّ يداً) فأخذوا قصبةً يذرعونها فكانت سودةُ أطولهُنَّ يداً فعلمنا بعدُ أنَّما كانت طولَ يدِها الصدقةُ وكانت أسرعنا لحوقاً بهِ وكانت تحبُّ الصدقةَ}[3]، واتە: هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتیان: بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم: کام لە ئێمە خێراتر دێت بەدواتا ؟

فەرمووی: (ئەوەتان کە دەستی لە هەمووتان درێژترە).

خێزانەکانی قامیشێکیان هێنا دەستیان پێ دەپێوا (سَودَة) لە هەموویان دەستی درێژ تربوو، بەڵام دوایی زانیمان مەبەستی بەدەست درێژی خێرو ماڵ بەخشین بوو!

---

١) رواه مسلم: (٤٤٩٠) .

٢) پێستی خۆش دەکردو، کاری مووروو کونکردنو نقێمو پیرۆزە پێوەکردنی دەکرد.

٣) رواه البخاري: (١٣٣١) .

ئەویش (واتە: زینب) یەکەم کەس بوو کە دوای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کۆچیکردو حەزیشی لە خێرکردن بوو.

هەروەها زانایانیش لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەی (بخاري)دا دەڵێن: (ڕاوی) بەهەڵە ناوی (سَوْدَة)ی هێناوە، چونکە بە تێکرای دەنگی زانایان (زینب) یەکەم کەس بوو لە خێزانەکانی دوای خۆی کۆچی دوایی کرد[١].

٧- لە ماڵەکەی خۆیدا ئۆقرە دەگرێت:- کاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حەجی ماڵئاواییدا بە خێزانەکانی دەفەرموێت: {هذه ثم ظهور الحُصنر}[٢]، دوای ئەوە هەموو خێزانەکانی حەجیان دەکرد تەنها (سودة و زینب)ی کچی (جحش) نەبێت، دەیانگوت: سوێند بە خوا ولاخ نامانجوڵێنێت پاش ئەوەی لە پێغەمبەری خوامان صلی الله علیه وسلم بیستووە.

٨- دونیا نەویستبوو:- (برزة)ی کچی (رافع)، دەڵێت: (عمر) خوای لێ ڕازی بێ، بەشە پارەکەی بۆ دەنێرێ، (زینب)یش دەڵێت: غفر الله لعمر، غیري کان أقوی علی قسم هذا.

{خوا لە (عمر) خۆش بێ لەمن بە تواناتر هەبوو ئەم پارەیە دابەشکا}، ئەوانیش وتیان: هەمووی هی خۆتە!

گوتی: سبحان الله ! ، ئینجا کراسێکی هێناو، گوتی: فڕێیدەنە ناویەوەو، کراسێکیش بدەن بەسەریدا، ئینجا پێی گوتم: دەست بکە بەناویدا مشتێکی ببە بۆ فلانو بۆ فلان لە هەژاران و هەتیوانی خزمەکانی، تاوەکو کەمێکی مابوویەوە (برزة) گوتی: ئەی دایکی ئیمانداران سوێند

---

١) بڕوانە: فتح الباري، (ج ٥ /١٤) .

٢) السلسلة الصحيحة: (٢٤٠١)، صحيح الترغيب و الترهيب: (٢/٢٢٠)، برقم: (١١٦٧) .

بەخوا مافى ئێمەشى تێدايە، ئەويش گوتى ئەوەى ماوەتەوە بۆ ئێوە، ئێمەش ژماردمان (٨٥) درهەم بوو، پاشان دەستى بەرەو ئاسمان بەرزكردەوەو، فەرمووى: (اللهم لا يُدركني عطاءُ عمرَ بعد عامي هذا)[١]، واتە: پەروەردگار لەم ساڵ بەدواوە بەخشينى (عمر)م پێنەگات.

## كۆچى دوايى

لە ساڵى (٢٠)ك لە (مدينة) كۆچى دوايى دەكات، ئينجا (عمر)ى كوڕى (الخطاب) فەرمان دەكات بە بانگكەرێك كە: ئەوەى مەحرەم نەبێت شوێن تەرمەكەى نەكەوێت، (أسماء)ى كچى (عميس)يش گوتى: ئەى ئەميرى ئيمانداران شتێكت نيشاندەم، كە (حبشي)يەكان دروستيان دەكرد بۆ ئافرەتەكانيان ؟ ئينجا تابوتێكى دروست كردو بە قوماشێك دايپۆشى، (عمرى كوڕى الخطاب)يش خواى لێ ڕازى بێ فەرمووى: (ما أحسن هذا وأستره!)، واتە: ئەمە چەندە چاكو داپۆشەرە !

ئينجا فەرمانى كرد بە بانگكەرێك (أن اخرجوا على أمكم)[٢]، واتە: هەمووتان شوێن تەرمى دايكتان بكەون.

(عمر)ى كوڕى (الخطاب) نوێژى لەسەر دەكاتو، پاشان دەنێرێ بۆ لاى خێزانەكانى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و پێيان دەڵێت: {من يأمرن أن يدخلها القبر} ؟، واتە: (كێ بەباش دەزانن بيخاتە ناو گۆڕەكەيەوە)؟

(عمر) حەزى دەكرد خۆى بێت، ئەوانيش وتيان: (انظر من كان يراها في حال حياتها فليكن هو الذي يدخلها القبر)، واتە: ئەو كەسە بينێرێ كە تا لە ژياندابوو دەيبينى.

---

١) سير أعلام النبلاء: (٢/٢١٢)، الإصابة: (١٢/٦٠)، البداية والنهاية: (٧/١١٩).
٢) سير أعلام النبلاء: (٢/٢١٣)، وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

ئەویش گوتی: (صـدقــتن[1]، واتە: ڕاست دەکەن.

ئـەنجا لـە گۆڕسـتانی (البقیـع) دەنێـژرێتو، یەکـەمین ئـافرەتیش بـوو کـە تـابوتی بۆ دروسـتکرا.

## ژمارەی ئەو فەرموودانەی گێڕاویەتیەوە

دایکــی ئیمانــداران (زینــب)ی کــچی (جحــش) خــوای لــێ ڕازی بــێ (١١) فەرموودەی لـە پێغەمبـەرەوە صلى الله علیـە وسـلم بـۆ گێڕاوینەتـەوە، کـە دوو فەرموودەیـان (متفق علیــە)یە.

## حیکمەتی خوازبێنی کـردنی (زینب) لە لایــەن پێغەمبــەرەوە صــلى الله علیە وسلم

لــەم هاوسەرگیــرییەدا گــەورەترین حیکمــەت بــەدی دەکرێــت، ئــەویش بەتاڵکردنەوەی یاسای بەکوڕکردن (التبـنّي)یە.

پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم دەفەرموێت: {مَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْـرِ أَبِيـهِ أَوْ انْتَمَى إِلَى غَيْـرِ مَوَالِيـهِ فَعَلَيْـهِ لَعْنَــةُ اللَّـهِ وَالْمَلَائِكَـةِ وَالنَّــاسِ أَجْمَعِــينَ لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَـرْفًا وَلَا عَدْلًا[2]، واتە: هەر کەسێك خۆی بکا بـە کوڕی کەسێك جگە لە باوکیو هەر کۆیلەیەکیش خـۆی بخاتـە ڕیـزی کەسانێك جگە لە خاوەنەکانی، ئەوا نەفرەتی خواو فریشتەکانو هـەموو خـەڵکی لێبێـت، خوای گەورە فەرزو سوننەتی لـێ وەرناگـرێ.

---

١) اخرجه الطحاوي و البيهقي وصححه الألباني في أحكام الجنــائز، ص: (١٤٨).
٢) رواه مسـلم: (٢٧٧٤).

## ئوم حه بیبه ی كچی ئه بو سوفیان خوای لێ ڕازی بێت [1]

ناوی: (رملـة)ی كچی (أبو سفیان صخر)ی كوڕی (حـرب)ی كـوڕی (أمیـة)ی كوڕی (عبد شـمس).

ناوی دایكی: (صفیة)ی كچی (أبو العـاص)ی كـوڕی (أمیـة).

حەڤدە سـاڵ پێش پێغەمبەرایەتی لەدایك بووە.

مێردی یەكەمی ناوی (عُبَیـد الله)ی كوڕی (رئاب)ی كوڕی (یعمر)ی (الأسـدي) هاوپەیمانی (أبو سـفیان)ە.

(أم حبیبـة) خۆیو هاوسـەرەكەی هەر لە (مكّـة) موسڵمان دەبنو لـە كۆچـی دووەمدا كـۆچ دەكـەن بـۆ وڵاتـی (حبـشـة)و لـەوێ كـچێكیان دەبـێ نـاوی دەنـێن (حبیبة)، كونیەی (أم حبیبة)ش لـەوەوە هاتووە.

لە (حبشـة) (عُبَید الله)ی هاوســەری كۆچی دوایی دەدات.

### خوازبێنــی كردنـی (أم حبیـبـة ) لە ســاڵی (٧)ی كۆچیدا

{عَـنْ عُــرْوَةَ، عـن أم حبیــبـة: أنها كـانت تحـت عبیـد الله بـن جحـش، فمـات بـأرض الحبـشـة، فزوَّجهـا النجـاشي النبــيَّ صـلى الله علیـه وسـلم ، وأمهرهـا عنـه أربعــة آلاف، وبعـث بهـا إلـى رسـول الله صـلى الله علیـه وسـلم مـع شُـرَحْبیلَ ابـنِ حَسَنَةَ[2] وجهازهـا كلـه مـن عنـد النجاشي ولم یرسـل إلیـها رسـول الله صلى الله

---

١) البدایة والنهایـة: (١٦٣/٤-١٦٥)، الإصـابة: (٤٨٨/٣)، الإسـتیعاب: (٩٥/٢)، سیــر أعـلام النـبلاء: (٢١٨/٢-٢٢٣)، الأعـلام للزركلـي: (٣٣/٣).

٢) صحیح أبي داود للألبـاني: (٣٣٧/٦)، برقم: (١٨٣٥).

علیه وسلم بشيء[1]، واته: عُروَة له (أم حبيبة)وه دەگێڕێتەوه، كه خێزانی (عبیدالله)ی كوڕی (جحش) بووه، له خاكی (حبشة) كۆچی دوایی كردووه، پاشان (نجاشي) مارەی كردووه بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و، چوار هەزار (درهم)ی بۆ كردووه به مارەیی، ئینجا (أم حبيبة) لەگەڵ (شرحبیل)ی كوڕی (حسنة)دا به هەموو پێویستییەكەوه دەینێرێ بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم هیچ شتێك نانێرێ بۆ مارەییەكەی.

خوێنەری بەڕێز:

له ریوایەتی تردا به دوورو درێژی باس لەم ڕووداوه كراوه كورتەكەی بەم شێوەیەیه: (أم حبيبة) كاتێك له (حبشة) دەبێ (عبیدالله)ی هاوسەری له خەودا به ناشیرینترین شێوه دەبینێ !

كه ڕۆژ دەكاتەوه مێردەكەی شەیتان فریوی دەداتو دەچێته سەر ئایینی گاورو دەست دەكاته گاڵتەكردن به موسڵمانانو (أم حبيبة)ش ڕووی لێوەردەگێڕێو نایبینێتەوه، تاوەكو لەوێ دەمرێت ...

هەروەها باس لەوەش دەكات كه لەكاتی مارەبڕینەكەدا هەریەك له (نجاشي)و (خالد)ی كوڕی (سعید)ی كوڕی (العاص)- ئامۆزای (أم حبيبة)- وتاریان خوێندوەتەوەو پاشان لەسەر خوانی (نجاشي) نانیان خواردووه، پاشان بڵاوەیان لێكردووه ...[2].

بەڵام هەموو ڕێگاكانی ئەم ریوایەته لاواز (ضعيف)ن، له ڕێگەیەكیانەوه (ابن لهيعة)و له یەكێكی تریشیانەوه (الواقدي) تێدایەو لەوی تریشیانەوه

---

١) رواه أحمد وصححه شعيب الأرناؤوط: (٢٧٤٤٨).

٢) رواه الحاكم في المستدرك والبيهقي في دلائل النبوة، وابن سعد في الطبقات.

(الزهري) بە(مرسل)ی ریوایەتی کردووە، کەواتە ئەم هەواڵە نابێتە بەڵگە بۆ پاشگەزبوونەوەی تەنانەت موسڵمانێکی ئاساییش لە ئاینەکەی، چ جای هاوەڵێکی بەرێزی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم[1].

**تێبینی سەبارەت بە فەرموودەیەك لە (صحيح مسلم)دا:**

فەرموودەکە (ابن عباس) دەیگێڕێتەوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

{قال ابنُ عبَّاس: كَانَ الْمُسْلِمُونَ لا يَنظُرُونَ إِلَى أَبِي سُفْيَانَ وَلا يُقَاعِدُونَهُ فقَالَ لِلنَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم يَا نَبِيَّ اللَّهِ ثَلاَثٌ أَعْطِنِيهِنَّ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: عِنْدِي أَحْسَنُ الْعَرَبِ وَأَجْمَلُهُ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ أَبِي سُفْيَانَ أُزَوِّجُكَهَا قَالَ: نَعَمْ قَالَ: وَمُعَاوِيَةُ تَجْعَلُهُ كَاتِبًا بَيْنَ يَدَيْكَ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: وَتُؤَمِّرُنِي حَتَّى أُقَاتِلَ الْكُفَّارَ كَمَا كُنْتُ أُقَاتِلُ الْمُسْلِمِينَ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: أَبُو زُمَيْلٍ وَلَوْلا أَنَّهُ طَلَبَ ذَلِكَ مِنَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم مَا أَعْطَاهُ ذَلِكَ لِأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُسْأَلُ شَيْئًا إِلَّا قَالَ نَعَمْ[2]}.

واتە: (ابن عباس) دەڵێ: موسڵمانان بە چاوی ڕێزەوە سەیری (أبو سفيان)یان نەدەکردو لەگەڵی دانەدەنیشتن، گوتی: بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سێ شت هەن پێمی ببەخشە.

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: چاکترینو جوانترینی ئافرەتی عەرەب لای منە، (أم حبيبة)ی کچی (أبو سفيان) لێتی مارە دەکەم.

فەرمووی: بەڵێ.

---

١) (تحقيق دعوى ردة عبيدالله بن جحش) مجلة البيان، العدد: (١٨٢)، ص (٢٢).

٢) رواه مسلم، برقم: (٤٥٥٧).

گوتی: (مُعَاوِيَة) بکه بە نووسەر لەلای خۆت، فەرمووی: بەڵێ.

گوتی: منیش بکه بە سەرکردە، تا بجەنگم لەگەڵ بێباوەڕان، وەك چۆن جەنگام لەگەڵ موسڵمانان.

فەرمووی: بەڵێ.

(أبو زُمَيْل) دەڵێ: ئەگەر داوای ئەمانەی نەکردایە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی نەدەبەخشی، چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم داوای هەر شتێکی لێکرابایە دەیفەرموو: بەڵێ.

زانایان دەڵێن: ئەم فەرموودەیە ئیشکالی تێدایە چونکە بەتێکڕای دەنگ (إجماع): پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێش ئازادکردنی (مكة) لە ساڵی (٧ یان ٦)ی کۆچی بەر لە موسڵمانبوونی (أبو سفيان)، (أم حبيبة)ی مارە کردووەو لە (حبشة)وە هاتووە بۆ لای بۆ (مدينة).

هەروەها گومانیش لەوەدا نیە، کە (أبو سفيان و معاوية)ی کوڕی دوای ئازادکردنی (مكة) لە ساڵی (٨)ك موسڵمان بوون، ئیتر چۆن دەڵێ: بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چاکترین‌و جوانترینی ئافرەتی عەرەب لای منە، (أمّ حبيبة)ی کچی (أبو سفيان)ە لێتی مارە دەکەم.

جا لێرەدا زانایان سەبارەت بەم فەرموودەیە بۆچوونی جیاوازیان هەیە، کە بە پێویستی دەزانم بەکورتی باسێکی لێوە بکەم:

١- زۆرێك لە پێشەوایانی زانستی (حديث)، وەك: (يحيى)ی کوڕی (سعيد الأنصاري‌و پێشەوا أحمد وأبو حاتم وإبن الجوزي وإبن حزم والقاضي عياض)، دەڵێن: سەنەدی ئەم فەرموودەیە (عكرِمَة‌ی کوڕی عمَار)ی تێدایە کەسێکی لاواز (ضعيف)ە، تەنانەت پێشەوا (البُخَاري) هیچ فەرموودەی لێنەگێڕاوەتەوە.

٢- هەندێكى تر لە زانايان دەڵێن: ئەم فەرموودەیە لاواز نیەو (أبو سفیان) مەبەستى (ئەو) كچەكەیەتى واتە (عَـزّة) بەڵام لەبەرئەوەى تازە موسڵمان بووە نەیزانیوە، كە دوو خوشك پێكەوە لە یەك پیاو مارە ناكرێن، بەڵكو (راوي) فەرموودەكە بەهەڵە ناوى (أمّ حبیبة)ى هێناوە.

بەڵام كۆمەڵى یەكەم دەڵێن: ئەگەر وایە چۆن پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم بە (أبو سفیان)ى فەرمووە: (نعم) ؟! لە كاتێكدا (أمّ حبیبة) جارێكیان بە پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم دەڵێت: (عَـزّة)ى خوشكم مارە بكە، لە وەڵامدا دەفەرموێ: (فإنّهَا لا تحِلُّ لِي)[1]، واتە: (حەڵاڵ نیە بۆم) !

٣- هەندێكى تر دەڵێن: مەبەستى (أبو سفیان) ئەوە بووە، كە پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم گرێبەستى مارەبڕین (عقد النكاح)ى بۆ تازە بكاتەوە، چونكە دەیویست لەناو هاوەڵاندا كەسایەتى خۆى بەهێزبكاتەوە، بەڵام وەڵامى ئەم بۆچونەشیان داوەتەوە بەوەى كە تا ئێستا نەبیستراوە پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم ئەو گرێبەستەى تازە كردبێتەوە!

٤- هەندێكى تر وەك: (أبو محمد المنذري) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم (أمّ حبیبة)ى لە(مدینة) دواى ئازادكردنى (مكة) خوازبێنى كردووە. ئەمەش لاوازترینى بۆچوونەكانە!

(إبن القیم) ڕەحمەتى خواى لێبێ، دەڵێت: ئەم بۆچوونانە (یەكەم نەبێ)، هەموویان (باطل)و بێسوودن‌و، ڕاى بەهێز ئەوەیە، كە ئەم فەرموودەیە لاوازە[2].

---

١) رواه مسلم: (٣٦٥٩).

٢) بڕوانە: جلاء الأفهام لأبن القیم: (١٨٥- ١٩٥)، عون المعبود: (٤٧٧/٤).

**پلەو پایەو سەروەرییەكانی**

١- (أمُ حَبیبَة) نوێژە سوننەتە (مؤكـدة)كانی بەردەوام كردووە:- قالت أمُّ حَبیبَةَ سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ صلی الله علیه وسلم یَقولُ: (مَن صَلی اثنَتَي عَشرَةَ رَكعَةً فِي یَومٍ ولَیلَةٍ بُنِيَ لَهُ بِهِنَّ بَیتٌ فِي الجَنَّةِ) قالَت أمُّ حَبیبَةَ فَمَا تَرَكتُهُنَّ مُنذُ سَمِعتُهُنَّ مِن رَسُولِ اللهِ صلی الله علیه وسلم، وَقالَ عَنبَسَةُ فَمَا تَرَكتُهُنَّ مُنذُ سَمِعتُهُنَّ مِن أمِّ حَبیبَةَ، وَقالَ عَمرُو بنُ أوسٍ مَا تَرَكتُهُنَّ مُنذُ سَمِعتُهُنَّ مِن عَنبَسَةَ، وَقالَ النُّعمَانُ بنُ سَالِمٍ مَا تَرَكتُهُنَّ مُنذُ سَمِعتُهُنَّ مِن عَمرِو بنِ أوسٍ[1]، واتە: (أمُ حَبیبَة) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بوو، دەیفەرموو: (هەر كەسێك لە شەوو ڕۆژێكدا دوانزە ركات نوێژی سوننەت بكات، خوا بەهۆیەوە ماڵێكی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەكات)، (أمُ حَبیبَة) دەڵێ: وازم لێنەهێناوە لەو ڕۆژەوەی لە پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بیستووە، (عَنبَسَة)ی كوڕی (أبو سفیان)یش، دەڵێ: منیش وازم لێنەهێناوە لەو ڕۆژەوەی لە (أمُ حَبیبَة)م بیستووە دوو (راوی)یەكەی تریش هەروا دەڵێن.

٢- (أمُ حَبیبَة) ئافرەتێكی خۆڕاگر بووە:- {قالَت زَینَبُ بِنتُ أبِي سَلَمَةَ: لَمَّا أتَى أمَّ حَبیبَةَ نَعيُ أبِي سُفیَانَ دَعَت فِي الیَومِ الثَّالِثِ بِصُفرَةٍ فَمَسَحَت بِهِ ذِرَاعَیهَا وَعَارِضَیهَا وَقالَت كُنتُ عَن هَذَا غَنیَّةً سَمِعتُ النَّبِيَّ صلی الله علیه وسلم یَقولُ لا یَحِلُّ لإمرَأةٍ تُؤمِنُ بِاللهِ وَالیَومِ الآخِرِ أن تُحِدَّ فَوقَ ثَلاثٍ إلاَّ عَلَى زَوجٍ فَإنَّهَا تُحِدُّ عَلَیهِ أربَعَةَ أشهُرٍ وَعَشرًا[2]، واتە: (زینب)ی كچی (أبو سَلَمَة) دەڵێ: كاتێك هەواڵی مردنی (أبو سفیان)

١) رواه مسلم: (١١٩٨) .

٢) رواه البخاري: (١٣٠١)، و مسلم: (٢٧٣٦).

دەگات بە (أمّ حَبيبَة)، لە ڕۆژى سێیەمدا داواى بۆیەو بۆنى خۆشى كرد، ئەنجا بۆنەكەیدا لە دەستى‌و هێناى بە هەردوو لاى دەموچاویدا، پاشان گوتى: من پێویستیم بەم بۆنە نەبوو، تەنها ئەوە نەبێ لە پێغەمبەرى خوام صلى الله علیه وسلم بیستووە كە دەیفەرموو: (حەڵاڵ نیە بۆ هیچ ژنێك، كە باوەڕى بە خواو ڕۆژى دوایى هەبێ، زیاتر لە سێ ڕۆژ ماتەمینى بگرێت بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد، كە چوار مانگ‌و دە ڕۆژە).

٣- (أمّ حَبيبَة) لە خوا دەپاڕێتەوە:- {قالت أمُّ حَبيبَة: اللهُمَّ متّعني بزَوجي رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم وَ بأبي أبي سُفْيَانَ وَ بأخي مُعَاوِيَة فقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم إِنّكِ سألتِ اللّهَ لآجَالٍ مَضرُوبَةٍ وَآثَارٍ مَوطوءَةٍ وَأرزَاقٍ مَقسُومَةٍ لا يُعَجِّلُ شَيئًا مِنهَا قَبلَ حِلّهِ وَلا يُؤخِّرُ مِنهَا شَيئًا بَعدَ حِلّهِ وَلَوْ سَألتِ اللّهَ أن يُعَافِيَكِ مِنْ عَذابٍ فِي النّارِ وَعَذابٍ فِي القَبرِ لَكَانَ خَيرًا لَكِ[1]، واتە: (أمّ حَبيبَة) گوتى: خوایە پێغەمبەرى هاوسەرم صلى الله علیه وسلم و (أبو سفیان)ى باوكم‌و (مُعَاوِيَة)ى برام تەمەن درێژكەى، پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرمووى: بەڕاستى تۆ لە خوا داواى درێژكردنەوەى تەمەنێكى دیاریكراوو، ڕۆزییەكى دابەشكراوت كردووە، خواى گەورە هیچیان لەكاتى خۆى پێشناخاو هیچیان لەكاتى خۆى دوا ناخا، ئەگەر داوات لە خواى گەورە بكردایە كە لە ئاگرى دۆزەخ‌و سزاى گۆڕ بتپارێزێت چاكتر بوو بۆت.

لەوانەیە بوترێت: سزاى گۆڕو دۆزەخیش، وەك ئەجەل بڕاوەیەو دیاریكراوە، ئەى حیكمەت چیە كە دوعا نابێتە هۆكاریك بۆ درێژكردنى تەمەن، بەڵام هۆكارێكى باشە بۆپاراستن لە سزاى گۆڕو ئاگرى دۆزەخ ؟

---

١) مسلم: (٤٨١٥).

پێشەوا (نووی) ڕەحمەتی خوای لێبێت، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێت: دوعاو پاڕانەوە بۆ ڕزگاربوون لە سزای گۆڕو ئاگری دۆزەخ عیبادەتو خواپەرستیە، خوای گەورەش فەرمانی داوە بە خواپەرستی، بەڵام دوعا بۆ تەمەن درێژکردن خواپەرستی نیە، هەروەك چۆن بە بیانووی قەزاو قەدەر وازهێنان لە نوێژو ڕۆژوو دروست نیە، دوعاکردنیش بەهەمان شێوەیە[١].

٤- (أمُّ حَبيبَة) دڵپاكو لێبووردە بووە:- {قالت عائشة: دعتني أم حبيبة عند موتها فقالت: قد كان يكون بيننا ما يكون بين الضرائر فتحلليني من ذلك فحللتها واستغفرت لها، فقالت لي: سررتني سرك الله وأرسلت الى أم سلمة بمثل ذلك[٢].

(عائشة) دەڵێ: (أم حبيبة) لەکاتی سەرەمەرگیدا بانگی کردمو پێی گوتم: ئەگەر شتێك لە نێوانماندا بووبێ، وەکو ئەوەی لەنێوان هەوێدا دەبێت گەردنم ئازاد بکە.

منیش گەردنم ئازادکردوو داوای لێخۆشبوونم بۆکرد، ئینجا گوتی: بەڕاستی دڵخۆشت کردم خوا دڵخۆشتکا، بەهەمان شێوە ناردی بە شوێنی (أمُّ سلمة)شدا.

٥- (أمُّ حَبيبَة) ڕقی لە بێباوەڕە تەنانەت ئەگەر باوکیشی بێ:- کاتێك (أبو سفيان) دەڕوات بۆ (مدينة) بۆ تازەکردنەوەی گرێبەستەکەی (حديبية)، لەوێ چووە ماڵی (أم حبيبة)ی کچی، ویستی لەسەر ڕاخەرەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دابنیشێت، لەژێریدا ڕای کێشا، ئەویش گوتی: يا بنية ما أدري أرغبت بي عن هذا الفراش، أو رغبت به عني؟

---

١) شرح النووي على مسلم: (١٧/٩).
٢) الاصابة في تمييز الصحابة: (٤٨٨/٣).

واتــە: کـچۆڵەکەم نــازانم ئــەو ڕاخــەرە شایــستەی مــن نــەبوو، یــان مــن شایستەی ئەو ڕاخەرە نەبووم ؟

گوتی: بـل هو فراش رسـول الله صلى الله عليه وسلم وأنت مـشرك نجـس، فـلـم أحب أن تجلس على فراشـه، فقـال: يـا بنيـة، والله لقـد أصـابك شـيء بعـدي، ثم خرج[1]، واتە: ئەوە ڕاخـەری پێغەمبـەری خوایـە صـلى الله عليـه وسلمو تۆ موشریکێکی پیسی، پێـم خۆشـنەبوو لەسـەری دابنیشی.

(أبـو سـفيان): کـچۆڵەکەم سـوێند بـە خـوا لـە دوای مـن شتێکـت تـووش بووە، پاشان چووە دەرەوە.

٦- (أمُ حَبيـبَة) کەسایەتیەکی بەهێـزی هەبووە:- بەڕێـز بووە بە تایبەت لە لای (معاوية)ی برای، هەر بۆیە بە (معـاويـة) وتـراوە خاڵی ئیمانداران[2].

**کۆچـی دوایــی**

لـە سـاڵی (٤٤)ی کۆچـی (أمُ حَبيبَـة) کۆچـی دوایـی دەکـاتو لـە گۆڕسـتانی (البقـيع) لە (مدينـة) دەنێـژرێت.

## ژمـــارەی ئــەو فەرموودانـــەی لــە پێغەمبــەرەوە صــلى الله عليــە وســلم گێڕاویەتیەوە

(٦٥) فەرموودەی لە پێغەمبـەرەوە صلى الله عليـە وسلم گێڕاوەتـەوە، متفـق عليــە (٢)، (مسلم)یش (٢) فەرموودە.

---

١) رواه البيهقي في دلائل النبـوة: (١٧٥٧)، وابن سـعد في الطبقات: (٨/٩٩، ١٠٠) و ضـعّفه الألبـاني في ردّه على فقـه السيـرة للبوطي، ص: (٣٧٣).

٢) سيـر أعـلام النبـلاء: (٢/٢٢٢)

# (صفیة)ی کچی (حیي) خـوای لـێ ڕازی بێت [1]

نـاوی: (صـفیة)ی کـچی (حـیَي)ی کـوڕی (أخطـب)ی (الخزرجي)یـه لـه (بنـو إسـرائیل)ه لـه نـهوهی پێغهمبـهر هـارونی بـرای پێغهمبـهر (موسـى)یـه سـهلامی خوایان لـێ بـێ.

باوکی سهرۆکی (بنو النضیـر) بوو، یهکێك بوو له تاوانبارهکانی جهنـگ، لـه جهنگی (بنو قریظة)دا چووبووه یهکێك له قهڵاکانیانهوه، گیـراو درا له ملـی.

دایکی: ناوی (بـرة)ی کچی (سـموال)ه له هۆزی (بنو قریظـة) بوو.

(صفیة) لهسهر ئاینی جولهکهو دانیشتووی شـاری (مدینة) بووه، خێزانـی (سـلام)ی کـوڕی (مـشکم) بـووه تـهڵاقی دهداتو، دواتـر دهبێتـه هاوسـهری (کنانـة)ی کـوڕی (أبـو الحـقیق)، ههردووکـیان لـه شاعیـرانی جولـهکـهن، دووهمیان له غهزای (خیبـر)دا بههۆی پهیمانشکێنیهوه دهکـوژرێت.

## خوازبێنـی کـردنی (صفیة) له سـاڵی (٧)ی کۆچـیـدا

پـاش کـوژرانی (کنـانة)ی کـوڕی (أبـی الحقیـق)ی هاوسـهری (صـفیة) لـه شـهڕی (خیبـر)دا بههۆی پهیمانـشکێنیهوه، (أنَس)ی کوڕی (مَالِك) خـوای لـێ ڕازی بـێ دهڵێ: کهنیزهکهکان کۆکرانهوه، (دحیَـةُ الكَلْبِیَ) خـوای لـێ ڕازی بـێ هـاتو گـوتی: ئـهی پێغـهمبهری خوا صـلى الله علیـه وسـلم کهنیزهکێکـم پێ ببهخشه.

---

١) الإستیعاب: (١٠٥/٢)، الأصابة: (١٨/٤)، الأعلام: (٢٠٦/٣)، سیـر أعلام النبلاء: (٢٣١/٢-٢٣٨).

فـەرمووى: (اذهَـب فخـذ جَارِيَـةً). بـڕۆ کەنیزەکـێ ببـــە، (بـە پێـی یاسـای جەنگ) ئەویش ڕۆیشـت (صَفِيَّة)ى کچـی(حُيَيّ)ى بـرد، پاشـــان پیاوێـك هـات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتـی: ئـەی پێغەمبـەری صلى الله عليه وسلم خـوا خانـــمی (قُرَيظَـة و النَّضِيـر) ئەبەخـشی بـە (دِحيَـة)، ئـەو شایستەی کەس نیـە تەنهـا تۆ نەبـێ !

فەرمـووى: (ادعُـوهُ بهَـا)، واتـە: پێـی بڵێن با بیهێنـێتەوە، ئینجا هێنایەوە.

کاتێـك پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم بینـی، فـەرمووى: {خـذ جَارِيَـةً مِـنَ السَّبي غَيرَهَا}، واتـە: کەنیزەکێکی تـر ببـە، ئینجا پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم ئـــازادی کـردو لـە بـری (صـــفية) کـەنیزەکێکی تریـدا بـە (دحيـــة)و، خوازبێـنی کردو ئازادکردنەکەشی کرده مارەیـی بۆی.

کە گەیشـتنە (سَـدّ الرَّوحَـاء) بـۆی حـەڵاڵ بوو[1](أمّ سليم) بـۆی ئامـادەکرد، شـــەو لـەوێ گواســتیەوە، کـە ڕۆژ بوویــەوە فـەرمووی: {مَـنْ كَـانَ عِنـدَهُ شَـيءٌ فَلـيَجِـيءْ بِــهِ}، واتـــە: هـەر کەسـێك خـواردنی لایـە بـا بیهێنـــێ، خوانێکی لـە پێسـت ڕاخسـت، بە هەموویانەوە خورماو ڕۆنو ئـاردیان هێنـاو فـەرمووی بـە ئەنەس ئەوانەی دەوروبەرت بانـگ بکـە، ئینجا کردی بە (وليمـة)و لـە ڕێگـەی (خیبـر) سـێ ڕۆژ لـەلای مایـەوە، ئینجا خەڵـکی گوتیـان: نـازانین پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم کردوویـەتی بـە خێزانـی خـۆی، یـان بـە کـەنیزەك؟ وتیان: ئەگەر حیجـابی بـۆ بکـات، ئـەوە خێزانیـەتی ئەگـەریش بـۆی نەکـات، ئەوە کەنیزەکـە، کاتێـك ویستی سواری وشـترەکەی ببـێ حیجابی بـۆ کـردو لـە

---

١) کەنیزەك دوای پاکبوونـەوەی لـە یـەك حـەیز دروسـتە شـوو بکـات، چونکە پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە کەنیزەکەکانی (اوطاس)، فـەرمووى: {لا توطأ حامـل حتـى تحيـض، ولا غيـر حامـل حتـى تحيض حيضـة}، رواه أحمـد وصـححه الألبـاني، بڕوانە: مختصـر ارواء الغلـيل: (٢٥٥/١) .

دواى وشتــرەكەوە دانيـشت، ئيتــر زانييــان خێزانيـەتى، كاتێـك لـە (مدينـة) نزيكبوونەوە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليـە وسـلم خێرايـى وشتــرەكەى زيـاد كردو ئێمەش زيادمان كرد، (العَضبَاءُ) - ناوى وشتـرەكەى پێغەمبـەرە صـلى الله عليـە وسـلم - سەرسـميداو هـەردووكيان كەوتنـە خـوارەوە، پێغەمبــەرى خـوا صلى الله عليـە وسلم هەسـتايەوەو (صــفية)ى شـاردەوە، ئينجــا هەنـدێك لـە ژنـان هـاتن‌و وتيـان خـوا ئـەم ژنـە جولەكــەيە دوورخاتــەوە - نـەيانزانى بـوو موسـڵمان بـووە -[١].

(ابـن عمـر) دەڵێ: پێغەمبــەر صـلى الله عليـە وسـلم پەڵەيـەكى سـەوزى بـە نێوچاوانى (صـفية)وە بينـى فەرمووى: {ما هـذه الخضـرة بعينيــك} ؟، واتــە: ئەو پەڵە سـەوزە چيــە بـەنێو چاوانتەوە ؟ گـوتى: لـە خەومـدا ئەسـتێرەيەكم بينـى كەوتـە كۆشـمەوە، خەونەكـەم گێڕايـەوە بـۆ مێردەكـەم، زللــەيەكيدا لـە دەموچـاوم‌و گوتى: پاشـاى (يثـرب)ت دەوێ ؟!

كەس نەبوو بە ئەنـدازەى پێغەمبــەرى خـوا صـلى الله عليـە وسـلم ڕقـم لـێى بێــت، باوكـــم‌و مێردەكــەمى كوشـــتبوو، بــەردەوام بيـــانوو (عـــذر)ى بــۆ دەهێنـامەوە دەيفـەرموو: (إن أبــاك ألــبَ علــيَّ العــرب وفعــل وفعــل)، واتـە: بەڕاستى باوكـت عەرەبى لێهـەڵگەڕاندمەوەو ئەوەو ئەوەى كرد)، تاوەكو هـيچ لـەو ڕقـە لـە دڵـمدا نەما[٢].

---

١) بڕوانـە: صحيح البخاري: ژمـارە: (٣٥٨، ٢٨٥٥، ٢٠٨١، ٣٨٩٠)، صـحيح مـسلم: ژمـارە: (٢٥٦١، ٢٥٦٤).

٢) السلسـلة الصحيحة للألباني: (٢٧٩٣)، صحيح ابن حبــان بتحقيــق شـعيب الأرنــاؤوط: (٥١٩٩).

## پلـەو پـايـەو سـەرومريەكـانـى

١- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەژنـۆی پیـرۆزی خۆی بـۆ دادەنـێ:- كاتێك بەرەو (مدينة) بەرێدەكـەون پێغەمبەری خوا صـلى الله عليـه وسـلم عەباكـەی لـە پـشت خۆیـەوە بـۆ ڕادەگـرێ پاشـان لای وشتـرەكەدا دادەنیـشێ و ئەژنـۆی پیـرۆزی بـۆ دادەنـێ ئـەویش قـاچ دەخاتەسـەری تـا سواری وشتـرەكە دەبێت[1].

٢- سـەردانی پێغەمبـەر صلى الله عليـه وسـلم دەكـات لـە (إعتكـاف)دا:- {عـن صفية بنت حيي، قالـت: كـان النبي صلى الله عليـه وسـلم معتكـفا، فـأتيـتـه أزوره ليـلا، فحدثتـه، ثـم قمـت لأنقلـب، فقـام معـي ليقلبنـي، وكـان مسكنهـا فـي دار أسامة بن زيد، فمر رجلان من الأنصار، فلما رأيا النبي صلى الله عليه وسلم أسرعا، فقـال النبي صلى الله عليه وسلم: {على رسلكما، إنها صفية بنت حيي} فقالا: سبحان الله يا رسول الله، قال: (إن الشيطان يجـري من الإنسـان مجـرى الـدم، وإني خشيت أن يقذف فـي قلوبكمـا شـرا)، أو قال شيئا[2]، واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لـە (إعتكـاف) دابـوو، شـەوێك سەردانم كردو، لەگەڵیدا دوام، پاشان هەسـتام بگەڕێمـەوە ئـەویش لەگەڵمـدا هەستا بمگەیەنێ- ماڵی (صفية) لـە مـاڵی (أسـامة)ی كـوڕی زیـد بـووە - دوو پیاوی (أنصـار)ی تێپەڕین، هەر كە پێغەمبەریان صلى الله عليه وسلم بینـی پەلەیان كرد پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فـەرمووی: لەسـەرخۆتان ئـەوە (صفية)ی كچی (حـُيیَ)یە، ئەوانیش وتیـان: (سبحـان) الله ئەی پێغەمبەری خوا صـلى الله عليـه وسـلم! فـەرمووی: لەڕاسـتیدا (شـیطان) وەك خـوێن بـە لەشدا دەگەڕێ، لەوە ترسام گومانێك بخاتە دڵتـانەوە.

---

١) رواه البخـاري: (٣٨٨٩).

٢) البخـاري: (٥٨٧٣)، ومسـلم: (٤١٣٥).

٣- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەبەر (صفية) (هجر)ی (زينب) دەكات:- {عن عائشة رضي الله عنها أنه اعتل بعير لصفية بنت حيي وعند زينب فضل ظهر فقال النبي صلى الله عليه وسلم لزينب أعطيها بعيرا فقالت أنا أعطي تلك اليهودية ؟! فغضب رسول الله صلى الله عليه وسلم فهجرها ذا الحجة والمحرم وبعض صفر}[1]، واتە: لە يەكێك لە سەفەرەكاندا وشترەكەی (صفية)ی كچی (حيي) نەخۆش دەكەوێت، (زينب)يش وشتری زیادەی پێ دەبێت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە (زينب) دەفەرموێ: وشترێكی بدەرێ.

(زينب) دەڵێ : بەو جولەكەیەی بدەم !

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تووڕە دەبێتو بۆ ماوەی دوو مانگو نیو (هجر)ی (زينب) دەكات.

٤- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەسفی دەكات:- عن زيد بن أسلم قال: اجتمع نساء النبي صلى الله عليه وسلم في مرضه الذي توفى فيه واجتمع إليه نساؤه فقالت صفية بنت حيي: إني والله يا نبي الله لوددت أن الذي بك بي فغمزن أزواجه ببصرهن.

فقال: مضمضن فقلن: من أي شيء فقال: من تغامزكن بها والله إنها لصادقة[2].

---

١) رواه أبو داود وقال الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٣/٥٠ ، رقم ٢٨٣٥) حسن لغيره.

٢) أخرجه ابن سعد: (٨/٢٨) وقال إبن حجر في الأصابة (٤/١٩): سنده حسن، وقال شعيب الأرناؤوط في سير أعلام النبلاء: ورجاله ثقات، لكنه مرسل.

(زيد)ى كوڕى (أسلم) دەڵێ: خێزانەكانى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە نەخۆشى سەرەمەرگیدا لە دەورى كۆبوونەوە، (صفية) وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم خۆزگە ئەوەى توشى تۆ بووە توشى من دەبوو، خێزانەكانى چاويان لە يەك داگرت !

پێغەمبەريش صلى الله عليه وسلم فەرمووى: لەدەمتانى وەردەن.

وتيان: چى ؟

فەرمووى: لە چاو داگرتنتان لێى، سوێند بە خوا ئەو ڕاست دەكا.

٥- كچى پێغەمبەرێكەو مامو هاوسەرەكەشى پێغەمبەرن:- {عن أنس قال: بلغ صفية: أن حفصة قالت: بنت يهوديّ ، فبكت ، فدخل عليها النبيُّ صلى الله عليه وسلم وهي تبكي، فقال: ما يُبكِيكِ؟ قالت: قالت لي حفصة: أنت ابنة يهوديّ، فقال النبيُّ صلى الله عليه وسلم: إنك لابنة نبيّ، وإن عمَّكِ لنبيّ، وإنك لتحت نبي، فبم تفخرُ عليكِ ؟ ثم قال اتقي الله يا حفصة[1]، (أنس) دەڵێ: هەواڵ گەيشت بە (صفية) كە (حفصة) پێى گوتوە كچى جولەكە ئيتر دەست دەكا بە گريانو لەوكاتەدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دێتەوە بۆلاىو پێى دەفەرموێ: بۆچى دەگريت ؟

دەڵێ: (حفصة) پێى گوتم: تۆ كچى جولەكەى!

پێغەمبەريش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: بەڕاستى تۆ كچى پێغەمبەرێكىو مامیشت پێغەمبەرەو خێزانى پێغەمبەرێكیشى ئيتر بە چ شتێكدا شانازى بەسەر تۆوە دەكات ؟ پاشان فەرمووى بە (حفصة): لە خوا بترسە[2].

---

١) رواه الترمذي والنسائي، بڕوانە: صحيح الترمذي (٣٠٥٥).

٢) صحيح الترمذي للألباني: (٣٠٥٥).

٦- ئافرەتێكى بەخشندە بوو:- {عن ابن المسيب، قال: قدمت صفية، وفي أذنيها خرصة من ذهب، فوهبت لفاطمة منه، ولنساء معها}[١]، واته: إبن المسيب دەڵێ: (صفية) هاتو لە كاتێكدا جووتێك گوارەى ئاڵتوونى لە گوێدا بوو، بەخشى بە (فاطمة)و چەند ژنێكى تر كە لەگەڵیدا بوون.

٧- زۆر لێبوردە بوو:- {قال إبن عبد البر: أن جارية لها أتت عمر بن الخطاب فقالت: إن صفية تحب السبت وتصل اليهود، فبعث إليها عمر فسألها فقالت: أما السبت فإني لم أحبه منذ أبدلني الله به يوم الجمعة، وأما اليهود فإن لي فيهم رحماً وأنا أصلها، قال: ثم قالت للجارية: ما حملك على ما صنعت ؟ قالت: الشيطان. قالت: اذهبي فأنت حرة[٢]، (إبن عبدالبر) دەڵێ: یەكێك لە كەنیزەكەكانى (صفية) ڕۆشت بۆ لاى (عمر)ى كوڕى (الخطاب) وتى: (صفية) ڕۆژانى شەممەى خۆشدەوێو سەردانى جولەكەكان دەكا !

(عمر) یش خواى لێ ڕازى بێ دەنێرێ بە شوێنیداو لەوبارەوە پرسیارى لێدەكا ؟

ئەویش دەڵێ: شەممەم خۆشنەویستووە لەو ڕۆژەوەى، كە خوا بۆى گۆڕیوم بە هەینى، جولەكەكانیش پەیوەندى خزمایەتیم لەگەڵیاندا هەیە جێبەجێى دەكەم، پاشان بە كەنیزەكەكەى گوت: چى واى لێكردى ئەم كارە بكەى ؟

گوتى: شەیتان !

(صفية)ش گوتى: بڕۆ ئیتر تۆ ئازادى.

---

١) رواه ابن سعد: (٨/ ١٢٧)، ورجاله ثقات، قاله شعيب الأرناؤوط في سير أعلام النبلاء (٢٣٧/٢).

٢) رواه إبن عبد البر في الإستيعاب: (١٠٥/٢).

٨- پشتگیری لە پێشەوا (عثمان) کرد لە کاتی گەمارۆدانی ماڵەکەیدا:-

{عن كنانة، قال: كنت أقود بصفية لترد عن عثمان، فلقيها الأشتر، فضرب وجه بغلتها حتى مالت؛ فقالت: ذروني، لا يفضحني هذا ! ثم وضعت خشبا من منزلها إلى منزل عثمان، تنقل عليه الماء والطعام[1]، واتە: کنانە دەڵێ: (صفية)م برد بۆ ئەوەی پشتگیری لە (عثمان) بکا خوای لێ رازی بێ، لە رێگادا (الأشتر) پێی دەگاو، دەکێشێ بە رووخساری وشترەکەیدا تا لار دەبێتەوە، ئینجا (صفية) گوتی: وازم لێبێنن، با ئەمە ناوم نەزڕێنێ !

پاشان دارێکی لەماڵ خۆیەوە بۆ ماڵی (عثمان) دانا لەوێوە خواردنو خواردنەوەی بۆ دەنارد.

## کۆچی دوایی

(صفية) لە خیلافەتی (معاوية)دا لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٥٠)ی کۆچیدا لە (مدينة) کۆچی دوایی دەکاتو لە گۆڕستانی (البقيع) دەنێژرێت.

## ژمارەی ئەو فەرموودانەی گێڕاویەتیەوە

(١٠) فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم گێڕاوەتەوە یەکێکیان (متفق عليه)یە.

١) أخرجه ابن سعد في الطبقات: (١٢٨/٨) ورجاله ثقات.

# (میمونة)ی كچی (الحارث) خوای لێ ڕازی بێت [1]

ناوی: (میمونة)ی كچی (الحارث)ی كوڕی (حزن)ی كوڕی (بجیر)ی كوڕی (الهرم)ی كوڕی (رویبة)ی كوڕی (عبدالله)یه.

ناوی دایكی: (هند)ی كچی (عوف)ی كوڕی (زهیر)ی كوڕی (الحارث)ی كوڕی (حماطة)یه.

خێزانی (مسعود)ی كوڕی (عمرو)ی (الثقفي) بووەو پێش ئیسلام تەڵاقی داوە، پاشان شووی كردووە بە (أبو رهم)ی كوڕی (عبدالعزى)ی (العامري) پاشان ئەویش كۆچی دوایی كردووە.

## خوشكەكانی (میمونة) لە دایكو باوكیەوە ئەمانەن

(أم الفضل لبابة الكبرى) كە خێزانی (العباس)ی كوڕی (عبدالمطلب) بووەو، دایكی (عبدالله)ی كوڕی (عباس) بووە، (لبابة الصغرى)ی خێزانی (الولید)ی كوڕی (المغیرة)ی (المخزومي) بووە، دایكی (خالد)ی كوڕی (الولید)ە.

## خوشكەكانیشی لە دایكیەوە ئەمانەن

(أسماء)ی كچی (عمیس) كە خێزانی (جعفر)ی كوڕی (أبو طالب) بووە، لەپاش شەهیدبوونی (أبو بكر)ی (الصدیق) دەیخوازێتو دوای مردنی (أبو بكر)یش (علي)ی كوڕی (أبو طالب) دەیخوازێت، هەروەها (سلمى)ی كچی

---

١) الإستیعاب: (١٢٠/٢-١٢١)، الإصابة: (٦٢/٤-٦٣)، الأعلام: (٣٤٢/٧)، سیر أعلام النبلاء: (٢٣٨/٢- ٢٤٥).

(عمیس)ی (الخثعمیـة) كـه خێزانـی (حمــزة)ی كوڕی (عبـدالمطـلـب) بـووە، (زینب)ی كچی (خزیمـة) پێش (میمـونة) خێزانـی پێغەمبـەر بـووە صـلـی الله علیه وسلم.

## خوازبێنـی كردنی (میمونة) لە ساڵی (٧)ی كۆچیـدا

دوای غەزای (خیبـر) پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم، لـه ساڵی (٧)ی كۆچیــدا بــەرەو (مكــة) بەڕێدەكەوێــت بــه نیــازی جێبــەجێكردنی (عمــرة القـضـاء)، پـێش چـوونه نـاو (مكــة) پێغەمبــەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم (جعـفر)ی كوڕی (أبـو طـالـب)[1] دەنێـرێ بـۆ خوازبێنـیكردنــی، (میمونــة)ش ئەم كـاره دەداتـه دەســت (عبـاس)ی زاوایـان، ئینجا پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم مارەی دەكـات. {كاتێك لە (مكـة) دەردەچـن (أبو رافع) بەجێـدێڵێ بـۆ ئــەوەی (میمونــة)ی بـۆ بگوازێتــەوە}، پاشـان لـه ڕێگـای گەڕانەوەیـدا لـه (سـرف)[2] دەیگوازێتەوە.

(إبن عبــاس) دەڵـێ: پـورم نــاوی (بــرة) بـوو، پێغەمبـەری خــوا صــلی الله علیه وسلم گـۆڕی بۆ (میمونة)[3].

(میمونــه) دواییــن ئافرەتــه، كـه پێغەمبــەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم خـوازبێنی كـردبێ.

---

١) تازه لە وڵاتی (حبشــة) گەڕابوویــەوە.
٢) شـوێنێكه لەسەر ڕێگـای (مكة)، (١٨)كـم لیـوەی دووره.
٣) أخرجه الحاكم: (٤/٣٠) وصـححه ووافقـه الذهـبي فـي سيـر أعـلام النبـلاء: (٢/٢٤٣).

## بابەتێکی فیقهـی

هەندێ لە زانایان وەك (أبو حنيفـة)و زانـایانی (كوفـة) دەڵێن: ئـەو کەسـەی لە ئیحرامدا بێت دروسـتـە خـوازبێنی بكـات (تەنهـا مـارە بـڕین) بەڵگـەشیان ئەم بەسەرهاتەی پێشـوو بوو، کە (إبـن عبـاس) دەیگێڕێتـەوە، کـە پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ئیحرام دابوو خوازبێـنی (میمونة)ی کـرد[1]، بـەڵام زۆرینەی هـاوەڵانو، هەروەهـا (مالِـك و شـافعي و أحمَد) دەڵێن: دروسـت نیـەو بەڵگەشـیان زۆرە، یەکێـك لەوانــە: {عَنْ عُثمَـانَ بنِ عَفّـانَ أنَّ رَسُولَ اللّهِ صلى الله عليـه وسلم، قـالَ: {لا يَنـكِـحُ المُحْـرِمُ وَلا يُنـكَـحُ وَلا يَخْـطُـبُ}[2]، واتـە: ئیحرامپۆش ژن مـارە ناکات بۆخـۆی، مارەیشـی نابڕێ لە کـەس، خوازبێنیـشـی ناکـات.

لـە وەڵامـی بەڵگەکـەی ئەوانیـشـدا دەڵێن: ئەمـە تـەنها ڕای إبـن (عبـاس)ەو (میمـونـة) خۆیو زۆربـەی هاوەڵان دەڵێن: لە ئیحـرامـدا نەبووە[3].

## پلـەو پـایـەو سـەروەرییەکـانـی

١- پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم شـایەتی ئیمـانی بۆ دەدا:- {عـن إبـن عبــاس قــال: قــال رسـول الله صـلى الله عليـه وسـلم: الأخــوات مؤمنــات: ميمونــة وأم الفضــل وأســماء[4]، واتـە: (ابـن عبـاس) دەڵـێ: پێغەمبــەری

---

١) رواه البخـاري: (١٧٠٦)، و مسلم: (٢٥٢٧).

٢) رواه مسلم: (٢٥٢٢ و ٢٥٢٤).

٣) بڕوانە: فتـح البـاري: (١٤/ ٣٦٥)، و شرح النـووي علـى صحيح مسـلم: (٩٩/٥).

٤ أخرجه النسائي في سننه: (١٠٣/٥)، و إبن سعد في الطبقات: (١٣٨/٨)، وصححه إبن حجر في الإصابة: ( ١٢٨/٨)، وحسنه الشيخ مصطفى العدوي في كتابه: الصحيح المسند من فضائل الصحابة ل ٥٦٣.

خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: خوشكەكان ئیمانداران: (ميمونة و أم الفضل و أسماء).

٢- زۆر ئومێدی بە خوای گەورە هەبوو :- {عن عبدالله بن عتبة أنَ ميمونة زوج النبَي صلى الله عليه وسلم استدانت، فقيل لها: يا أمّ المؤمنين تستدينين وليس عندك وفاء ؟ إنّي سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: من أخذ ديناً وهو يريد أن يؤديهُ، أعانه الله عزّ وجلّ[1]، واتە: (عبدالله)ی كوڕی (عتبة) دەڵێ: (ميمونة)ی خێزانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قەرزی كرد، وتیان: دایكی ئیمانداران، قەرز دەكەیتو هیچیشت نیە بیدەیتەوە !؟

وتی: من لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (هەر كەسێك قەرزێك وەرگرێو نیازی دانەوەی هەبێت خوای گەورە هاوكاری دەكات).

٣- زۆر لەخواترس بوو:- {قال يزيد بن الأصم: تلقيت عائشة من مكة أنا وابن طلحة من أختها وقد كنا وقعنا على حائط من حيطان المدينة فأصبنا منه فبلغها ذلك فأقبلت على بن أختها تلومه ثم أقبلت علي فوعظتني موعظة بليغةً ثم قالت: أما علمت أن الله ساقك حتى جعلك في بيتٍ من بيوت نبيه ذهبت والله ميمونة ورمى بحبلك على غاربك أما أنها كانت من أتقانا لله وأوصلنا للرحم[2]، واتە: (يزيد)ی كوڕی (الأصم) خوشكەزای (ميمونة) دەڵێ: منو كوڕەكەی (طلحة)ی خوشكەزای (عائشة) ڕۆشتینە ناو باخێك لە باخەكانی (مدينة)و لێمان

---

١) صحيح سنن النسائي للألباني، برقم: (٤٦٨٧) .

٢) أخرجه إبن سعد في الطبقات بسند صحيح، قاله إبن حجر في الإصابة: ( ٦٣/٤)، وحسنه شعيب الأرناؤوط في سير اعلام النبلاء: (٢/ ٢٤٤).

خوارد، (عائشة) بیستیو هات بەرەو ڕووی خوشکەزاکەیو سەرزەنشتی کرد، پاشان ڕووی لەمن کردو ئامۆژگارییەکی بەپێزی کردم، پاشان گوتی: ئایا نەتزانیوە خوا تۆی هێنا، تا ناردیتیە ماڵێك لە ماڵەکانی پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم، سوێند بە خوا (میمونة) ڕۆشتو کاری خۆتی دایە دەست خۆت، بەڕاستی ئەو لە هەموومان بە تەقواتر بوو لە هەمووشمان زیاتر پەیوەندی خزمایەتی دەگەیاند.

٤- سەرپێچی لە خزمەکانیشی قبوڵ نەدەکرد :- {قال يزيد بن الأصم: أن ذا قرابة لميمونة دخل عليها، فوجدت منه ريح شراب، فقالت: لئن لم تخرج إلى المسلمين، فيجلدوك، لا تدخل عليَّ أبداً[1]، واتە: (یزید)ی کوڕی (الأصم) دەڵێ: خزمێکی (میمونة) هات بۆ ماڵیان، بۆنی مەی لێدەهات، (میمونة) گوتی: ئەگەر نەچی بۆلای موسڵمانان، بۆ ئەوەی جەڵدەت لێبدەن، هەرگیز سەردانم نەکەیت.

٥- بەخشندە بوو:- {عَنْ كُرَيْب عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الحَارِثِ أَنَّهَا أَعْتَقَتْ وَلِيدَةً فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ لَوْ أَعْطَيْتِهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لِأَجْرِكِ[2]، واتە: (کُرَیب) دەڵێ: (مَیْمُونَة)ی کچی (الحَارِث) کەنیزەکێکی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ئازاد کرد، ئینجا بۆ پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم باسکرد، ئەویش فەرمووی: ئەگەر بتبەخشیایە بە خاڵۆکانت پاداشتی زیاتربوو بۆت.

---

١) أخرجه ابن سعد: (٨/ ١٣٩)، و حسنه الأرناؤوط: (٢/ ٢٤٤).

٢) البخاري: (٢٤٠٣) ومسلم: (١٦٦٦)، بۆیە وای فەرموو، چونکە چاکەکردن لەگەڵ خزماندا لە پێشترە، بەتایبەت کاتێك پێویستیان پێیبێت.

٦- ئافرەتێکی لێزان بوو:- {عن كُريب عَنْ مَيمُونَـة زَوْجِ النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم أنَّهَا قالَتْ إنَّ النَّاسَ شَكُّوا فِي صِيَامِ رَسُولِ اللَّه صلى الله عليه وسلم يَوْمَ عَرَفَةَ فأرسَلَتْ إليْهِ مَيمُونَـةُ بِحِلابِ اللَّبَنِ وَهُوَ وَاقِفٌ فِي المَوْقِفِ فشَرِبَ مِنهُ وَالنَّاسُ يَنظُرُونَ إليهِ[1]، واتە: لە (كُرَيب)ەوە (مَيمُونَـة)ی خێزانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەڵێت: خەڵكی گومانیان هەبوو دەربارەی بەڕۆژووبوونی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە ڕۆژی (عَرَفة)دا، (مَيمُونَة) قاپێك شیری بۆ دەنێرێ لەكاتێكدا بەسەر وشترەكەیەوە بوو، هەندێكی لێخواردەوەو خەڵكیش سەیریان دەكرد.

## كۆچی دوایی

{قالَ عَطاءٌ: حَضَرْنَا مَعَ ابنِ عَبَّاسٍ جِنَازَةَ مَيمُونَةَ بِسَرِفَ فقَالَ ابنُ عَبَّاسٍ هَذِهِ زَوْجَةُ النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم فإذَا رَفَعْتُمْ نَعْشَهَا فلا تُزَعْزِعُوهَا وَلا تُزَلْزِلُوهَا وَارْفُقُوا فإنَّهُ كَانَ عِندَ النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم تِسْعٌ كَانَ يَقْسِمُ لِثمَانٍ وَلا يَقْسِمُ لِوَاحِدَةٍ[2]، واتە: (عَطاء) دەڵێ: لەگەڵ (إبن عباس)دا لە ناوچەی (سَرِف) ئامادەی ناشتنی تەرمی (مَيمُونَـة)ی خێزانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بووین (إبن عباس) گوتی: ئەمە خێزانی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم كاتێ تەرمەكەیتان بەرزكردەوە بە هێمنیو لەسەرخۆ بیبەن، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نۆ خێزانی هەبوو نۆرەی دەدا بە هەشتیانو نەیدەدا بە یەكێكیان.

(میمونة) لەساڵی (٥١)ی كۆچیدا لە تەمەنی (٨٠) ساڵیدا هەر لە (سَرِف) كۆچی دوایی كرد، (ابن عباس) نوێژی لەسەر دەكات لەگەڵ (یـزید)ی كوڕی

---

١) البخاري: (١٨٥٣)، ومسلم: (١٨٩٦) .
٢) رواه البخـاري، برقم: (٤٦٧٩)، ومسلم: (٢٦٦٠).

(الأصـــم)و (عبـد الله)ى كـوڕى (شـــداد)ى كـوڕى (الهــادي)[1]و (عبيــد الله)ى الخـولاني[2].

## ژمارەی ئەو فەرموودانەی گێڕاویەتیەوە

(١٣) فــەرموودەی لــە پێغەمبــەرەوە صــلى الله عليــە وســلم گێـــڕاوەتەوە، حەوتیـان لە (الصحيحين) دایە، بەم شێوەیە:

(متفـق عليـه) یـەك فـەرموودە، (البخـاري) یـەك فـەرموودە، (مـسلم) پێـنج فەرموودە.

١) ئەم سیانەیـان خوشـكەزای (میمونة) بوون.

٢) ئەمیش هــەتیو بووە، (میمونة) بەخێوی كردووە.

# كەنیزەكەكانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جگە لە خێزانەكانی چەند كەنیزەكێكیشی هەبووە لەوانە: (ريحانة)ى كچی (زيد)و، (مارية)ى (القبطية). بەڵام لەسەر ڕای بەهێزی زانایان كەنیزەكەكانی بە دایكانی ئیمانداران ناژمێررێن ئەویش بە پشتبەستن بەم بەڵگانەی خوارەوە:

١- ڕواڵەت (ظاهر)ى ئایەتی: ﴿... وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَـٰتُهُمْ ...﴿٦﴾﴾ الأحزاب، واتە: خێزانەكانی دایكانی ئیماندارانن.

٢- (أنس)ى كوڕی (مالك) دەڵێت: كاتێك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەنێوان (خيبر و مدينة)دا (صفية)ى گواستەوە هاوەڵان وتیان: (إنْ حَجَبَهَا فَهِيَ مِنْ أمَّهَاتِ المُؤمِنِينَ وَإنْ لَمْ يَحْجُبْهَا فَهِيَ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ، فَلَمَّا ارتحَلَ وَطَى لَهَا خَلْفَهُ وَمَدَّ الحِجَابَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ)[١]، واتە: ئەگەر حیجابی بۆ بكات – واتە دەموچاوی داپۆشێت- ئەوە لە دایكانی ئیماندارانە ئەگەریش بۆی نەكات، ئەوە لە كەنیزەكەكانیەتی،

كاتێك ویستی بڕوات لەدوای خۆیەوە سواری وشترەكەی كردو حیجابی بۆ كرد، بۆیە (ابن تيمية)ش دەڵێت: (وَفِي الحَدِيثِ دَلِيلٌ عَلَى أنَّ أمُومَةَ المُؤمِنِينَ لِأزْوَاجِهِ دُونَ سَرَارِيهِ وَالقُرآنُ مَا يَدُلُّ إلا عَلَى ذَلِكَ)[٢]، واتە: لەم فەرموودەیەدا بەڵگە هەیە بۆ ئەوەی كە دایكایەتی ئیمانداران تایبەتە بە خێزانەكانیەوە بەدەر لە كەنیزەكەكانی، قورئانیش ئەمە نەبێت هیچی تر ناگەیەنی.

---

١) رواه البخاري: (٥٠٨٥) .

٢) مجموع الفتاوى: (٣/٣٨٨).

# (ریحانة)ی كچی (زید)[1]

نــاوی (ریحــانة)ی كچی (زیـد)ی كـوڕی (عمــرو)ی كوڕی (خنــافة)یـه، لـه هۆزی (بنــي قریظـة)یه.

پاش سەركەوتنی موسـڵمانان لـه غـەزای (بنــي قریظـة)دا پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم مـاڵو سـامانەكەیانی دوای دەرهێنـانی پێنجیـەك دابـەش كردو، له ژنەكانیشـیان (ریحـانة)ی هەڵبژاردو، باسی ئایینی ئیسلامی بۆ دەكات، بەڵام له سەرەتاوە موسڵمان نابێتو لەسەر ئایینی خۆی (جولەكە) دەمێنێتەوە، پێغەمبـەری خـوایش صلی الله علیـه وسـلم بـەو هەڵوێـستەی نارەحـەت دەبـێو دەستــبەجێ وازی لێدەهـێنی، تـا ڕۆژێكیـان پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم لەگـەڵ هاوەڵانیـدا دەبـێ لـه پـشت خۆیـەوە دەنگـی پێـی كەسـێك دەبیـستێ، دەفەرموێ: {هـذا ثعـلبة بـن سـعیة یبـشرني باســلام ریحانـة)}، واتـه: ئـەوە (ثعلبـة)ی كوڕی (سعیة)یـه هـاتووە مـژدەی موسڵمانــبوونی (ریحـانة)م بداتێ، ئینجـا دێـتو مـژدەی پێـدەداتو پێغەمبــەریش صـلی الله علیـه وسـلم بـەوە دڵخۆش دەبێتو دەینـێری بۆ ماڵی (أم منذر)ی كچـی (قیـس)، لـەوێ دەبێـت تـا حەیزێك دەشـواتو، پاشــان (أم منــذر) پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم ئاگــادار دەكــاتەوە، ئـەویش دەچێت بـۆ لایو دوو شـت دەخاتـه بەردەسـتی، یـا ئازادیـكاو بیخوازێو حیجابی بۆ بكات، یان به كەنیزەكی لـەلای بمێنێتەوە ؟

(ریحانة)ش خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: {یا رسول الله بل تتـركني في ملكك فهو أخف علي وعليك[1]، واته: به كەنیزەكی لەلات بم بۆ تۆیش بۆ منیش سووكترە.

---

١) أسـد الغــابة: (٣/٣٥٥)، الإصــابة: (٧/٦٥٨)، الأســتیعاب (٢/٩٧).

**کۆچی دوایی**

**لەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حەجی ماڵئاوایی کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی (البقیع) دەنێژرێت.**

**بەڵام هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن: لە خیلافەتی (عمر)دا خوای لێ ڕازی بێت، کۆچی دوایی کردووەو خۆیشی نوێژی لەسەر کردووەو هەر لە هەمان گۆڕستان ئەسپەردە کراوە.**

**١) ذكره ابن حجر في الإصابة: (٦٥٨/٧)، وابن الأثير في أسد الغابة: (٣٥٥/٣)، وابن كثير في البداية والنهاية: (٣٢٦/٥).**

# (ماریة)ی (قبطية)[1]

ناوی: (مارية)ی کچی (شمعون)ی قبطي)یە، دایکیشی گاور(مسیحي) ڕۆمی بووە.

لە دێی (حفن)ی سەر بە شارۆچکەی (أنصنا) لە ناوچەی (صعید)، کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری نیل لە وڵاتی (مصر) لە دایك بووە.

## هاتنی (مارية) بۆ (مدينة) لە ساڵی (٧)ی کۆچی

کاتێك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە (حديبية) گەڕایەوە دەستی کرد بە نامەنووسین بۆ پادشاکان و تێیدا بانگیکردن بۆ ئیسلام، یەکێك لەوانە (جريج)ی کوڕی (میناء) کە شۆرەتەکەی (مقوقس)ە، پادشای (مصر و أسکندرية) بوو، بە (حاطب)ی کوڕی (أبو بلتعة)دا نامەکەی بۆ نارد، ئەمەش دەقەکەیەتی:

{بسم الله الرحمن الرحيم من محمد عبد الله ورسوله إلى المقوقس عظيم القبط سلام على من اتبع الهدى أما بعد: فإني أدعوك بدعاية الإسلام أسلم تسلم وأسلم يؤتك الله أجرك مرتين، فإن توليت فإن عليك إثم القبط) ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ آل عمران، واتە: لە (محمد)ی بەندەی خوداو

1) الإستيعاب: (٢/ ١١٩)، الإصابة: (١٢/٣٣٨- ٣٣٩)، الأعلام: (٥/٢٥٥)، البداية والنهاية: (٥/٣٢٤-٣٢٨)، أسد الغابة: (٧/٢٨٢).

نێرراویەوە بۆ (مقوقس)ی گەورەی قیبتیەکان، سەلام لەو کەسەی شوێنی هیدایەت کەوتوە، بانگت دەکەم بە بانگەوازی ئیسلام، موسڵمان بە سەلامەت دەبیت، موسڵمان بە خوای گەورە دووجار پاداشتت دەداتەوە، ئەگەر ملکەچیش نەبوویت ئەوا تاوانی قیبتیەکان لە ئەستۆی تۆدایە، ﴿ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە خاوەن نامەکان بڵێ: وەرن با ئێمەو ئێوە لەسەر بەرنامەیەك سووربین، کە بۆ هەردوولامان یەکسانە، کە جگە لە خوا کەسێکی تر نەپەرستین و هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشیو هەندێکیشمان لەباتی خوا نەکەینە خواو بپەرسترێن، ئەنجا ئەگەر هەر ڕوویان وەرگێڕا پێیان بڵێن: دەسا ئێوە شایەت بن، کە ئێمە موسڵمانین﴾.

ئینجا مقوقس بە (حاطب) دەڵێ: بەڕاستی من سەبارەت بە کاری ئەم پێغەمبەرە وردبوومەوە، بۆم دەرکەوتووە فەرمان نادات بە هیچ شتێکی خراپو ڕێگریش ناکات لە هیچ شتێکی چاك، نە جادووگەرێکی گومڕایەو نە فاڵچییەکی درۆزنە، لەگەڵ ئەوەشدا من بەڵگەی پێغەمبەرایەتیم تێدا بینیوە ئەویش بە دەرخستنی شتە نهێنییەکانو هەواڵدان بە شتە شاراوەکان، لە داهاتوویەکی نزیکیشدا بیری لێدەکەمەوە.

ئینجا نامەکەی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم خستە ناوو مۆری کردو دایە دەست کەنیزەکێکی خۆی، پاشان نووسەرێکی خۆی بانگکرد، بە زمانی عەرەبی بۆ پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم نووسی:

بسم الله الرحمن الرحيم بۆ (محمد)ی کوڕی (عبدالله) لە (مقوقس)ی گەورەی قیبتەوە، سڵاوت لێبێ، پاشان: بەڕاستی نووسراوەکەتم خوێندەوە، لەوەش تێگەشتم، کە تێیدا باست کردووەو بانگی بۆ دەکەیت، دەشزانم، کە پێغەمبەرێك ماوەو بەڕێوەیە، پێشموابوو لە شامەوە دەربکەوێت، بەڕاستی ڕێزم لە نێرراوەکەیشت گرت، دوو کەنیزەکیشم بۆ ناردوویت، کە لەناو قیبتیەکاندا پلەو پایەیان هەیە، لەگەڵ هەندێ جلو بەرگدا، هێسترێکیشم

بۆ ناردوویت تاسواری بیت، سڵاوت لێبێت. ئیتر لەمە زیاتر هیچی تری نەوتو موسڵمانیش نەبوو[١].

دوو کەنیزەکەکەش (ماریة و شیرین)ی خوشکی بوون، هێسترەکەش ناوی (دلدل) بوو، تا سەردەمی (معاویة)ش هەرمابوو، هەروەها کۆیلەیەکی ڕەش پێستیشیان لەگەڵ بوو بە ناوی (مأبور) ئامۆزای (ماریة) بوو.

هەر لە ڕێگادا (حاطب)ی کوڕی (أبي بلتعة) باسی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان بۆ دەکات، (ماریة)و شیرین موسڵمان دەبن، بەڵام (مأبور) دواتر لە (مدینة) هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم موسڵمان دەبێت.

پێغەمبەری خوایش صلى الله عليه وسلم (ماریة) دەکا بە کەنیزەکی خۆیو (شیرین)ی خوشکیشی دەدا بە (حسّان)ی کوڕی (ثابت).

##ماڵی (ماریـة) خوای لێ ڕازی بێ

(عائشة) خوای لێ ڕازی بێ دەڵێت: هیچ ئافرەتێکم لەلا قورس نەبوو بە ئەندازەی (ماریة)، چونکە ئافرەتێکی جوانی قژ لوول بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەرسام بوو پێی، لە سەرەتاوە هێنایە ماڵی (حارثة)ی کوڕی (النعمان)و، بوویە دراوسێمان، زۆربەی شەوو ڕۆژ لەلای دەمایەوە، تاوەکو ترساندمان ئەویش ئۆقرەی لێبرا، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ماڵەکەی گواستەوە ناوچەی (العالیة)[٢] ئیتر لەنۆرەی خۆیدا لەوێ لەلای دەمایەوە، ئینجا ئێمەش ئەمەمان لەلا قورس تربوو[١].

---

١) زاد المعاد في هدي خير العباد: (٣/٦٩١- ٦٩٢).

٢) هەروەها (مشربة)ی (أم إبراهیم)یشی پێدەوترێ، باخێك بووە کەوتۆتە باشووری ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی (مدینة)وە، (٣) کم لێوەی دوورە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە هەندێك سەردانەکانیدا بۆ ئەوێ نوێژی تێدا کردووە، ماریەش هەر لەوێ

## لەدایكبوونی (إبراهیم)و كۆچكردنی

له مانگی (ذي الحجة)ی ساڵی (٨) ك، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم له (ماریة) كوڕێكی دەبێت، (سلمی)ی خێزانی (أبو رافع) مامان دەبێ، (أبو رافع)یش مژدە دەداتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەریش كۆیلەیەك دەداتە (ابو رافع).

(أنس)ی كوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وُلِدَ لِي اللَّيلةَ غُلامٌ فَسَمَّيْتُهُ باسْمِ أبي إبْرَاهِيمَ)، واتە: ئەم شەو كوڕێكم پێبەخشراوە ناوم نا بە ناوی باوكم (إبراهیم)، پاشان - هەر له العالیة - دەیداتە دەست دایەنێك بە ناوی (أم سیف)، ژنی پیاوێكی ئاسنگەر بوو پێیدەوترا (أبو سیف)، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگەڕایەوە بۆ لای ئێمەیش لەگەڵی بووین دەڕۆیشتە ژوورەوە ماڵەكە دووكەڵی لێبەرزدەبوویەوە، چونكە مێردی شیردەری (إبراهیم) ئاسنگەر بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیگرتو ماچو بۆنی دەكردو ئەوەی خوا بیویستایە دەیفەرموو، پاشان دەگەڕایەوە، دواجار ڕۆشتینەوە بۆ لای لە سەرەمەرگدا بوو، ئەنجا لە باوەشی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بینیم گیانی دەداو هەردوو چاوی پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فرمێسكی پیادەهاتە خوارەوە.

(عبد الرحمن)ی كوڕی (عوف) پێی گوت: تۆش دەگریت ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ؟

---

ماوەتەوە تا كۆچی دوایی كردووە، دواتر لە سەردەمی ویلایەتی (عمر)ی كوڕی (عبدالعزیز)دا ڕەحمەتی خوای لێ بێ بەسەر (مدینة)دا كراوە بە مزگەوت.

١) الإصابة: (١١٢/٨) .

فەرمووی: {إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ وَلا نَقُولُ إِلاَّ مَا يَرْضَى رَبُّنَا وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ}[1]، واتە: بێگومان چاو فرمێسك دەڕێژێتو دڵیش خەمبار دەبێتو، هیچیش ناڵێین، جگە لەوەی پەروەردگارمان پێیڕازییە، ئەی (ابراهیم) بەڕاستی بە جیابوونەوەت دڵتەنگین.

لە ریوایەتێکی تردا فەرموویەتی: {إِنَّ إِبْرَاهِيمَ ابْنِي وَإِنَّهُ مَاتَ فِي الثَّدْيِ وَإِنَّ لَهُ لَظِئْرَيْنِ تُكَمِّلانِ رَضَاعَهُ فِي الْجَنَّةِ}[2]، واتە: بەڕاستی (ابراهیم) کوڕی من بوو، لە کاتێکدا مرد دەمی بە مەمکەوە بوو، بەڕاستی دوو شیردەری هەیە لە بەهەشتدا ماوەی شیردانەکەی بۆ تەواو دەکەن .

(إبراهیم) لە ساڵی (١٠)ك، و لە تەمەنی ( ١٨) مانگیدا کۆچی دوایی کردووە.

**پلەو پایەی (ماریة)**

١- کەنیزەکێکی داوێن پاك بوو:- {عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَجُلا كَانَ يُتَّهَمُ بِأُمِّ وَلَدِ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لِعَلِيٍّ اذْهَبْ فَاضْرِبْ عُنُقَهُ فَأَتَاهُ عَلِيٌّ فَإِذَا هُوَ فِي رَكِيٍّ يَتَبَرَّدُ فِيهَا فَقَالَ لَهُ عَلِيٌّ اخْرُجْ فَنَاوَلَهُ يَدَهُ فَأَخْرَجَهُ فَإِذَا هُوَ مَجْبُوبٌ لَيْسَ لَهُ ذَكَرٌ فَكَفَّ عَلِيٌّ عَنْهُ ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ لَمَجْبُوبٌ مَا لَهُ ذَكَرٌ}[3]، (انس) دەڵێ: پیاوێك تۆمەتبار کرابوو بە چوونە لای دایکی کوڕەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، (ماریة) خوا لێی ڕازی بێ پێغەمبەری خوایش صلى الله عليه

---

١) رواه البخاري: (١٣٢٠)، ومسلم: (٤٢٧٩).
٢) رواه مسلم: (٤٢٨٠).
٣) رواه مسلم: (٤٩٧٥)، والحاكم: (٤/ ٣٩-٤٠)، وأحمد: (٣/ ٢٨١) .

وسلم فەرمووی بە (علي) خوای لێ ڕازی بێ: بڕۆ بدە لە گەردنی، ئەویش ڕۆشت بینی لە حەوزێك ئاودا خۆی فێنك دەکاتەوە، پێی گوت وەرە دەرەوە، دەستی گرتو هێنایە دەرەوە بینی کەسێکە شەرمنگەی نیە، واتە: کەسێك بوو، زەکەری نەبوو (إبن عبدالبر و إبن حجر) دەڵێن: ئەو پیاوە تۆمەتبارە ئامۆزاکەی (مارية) بوو، کە ناوی (مأبور) بوو[1]، هەندێ لە زانایان لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێن: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیویستووە ئەم پیاوە بکوژێ، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە بۆ خەڵکی ڕوون بێتەوە، کە پیاوێکی بێگونە.

٢- (معاوية) باجی لەسەر زەویەکانی لادێی (مارية) هەڵدەگرێت:- {عَنْ أبي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلی الله علیه وسلم إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ مِصْرَ وَهِيَ أَرْضٌ يُسَمَّى فِيهَا الْقِيرَاطُ فَإِذَا فَتَحْتُمُوهَا فَأَحْسِنُوا إِلَى أَهْلِهَا فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِمًا أَوْ قَالَ ذِمَّةً وَصِهْرًا}[2]، واتە: بەڕاستی ئێوە لە داهاتوودا وڵاتی (مصر) ئازاد دەکەن، کە زەوییەکە ناوی (قیراط)ی تێدا دەبرێ، کاتێ ئازادتان کرد لەگەڵ خەڵکەکەیدا چاکە بکەن، چونکە ئەوان بەڵێن و پەیوەندی خزمایەتییان هەیە لەگەڵمان.

هاوەڵانیش خوایان لێ ڕازی بێ وەسیەتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جێبەجێ دەکەن، یاقوت دەڵێ (حسن)ی کوڕی (علي) خوایان لێ ڕازی بێ کاتێك زانی(مارية) خەڵکی لادێی (حفن)ە لەگەڵ (معاوية)دا قسە دەکات ئەویش باج (خراج) لەسەر زەوییەکانیان هەڵدەگرێت[3].

---

١) الإستيعاب: (١١٩/٢)، الإصابة: (٧٠٠/٥) .

٢) رواه مسلم: (٤٦١٥).

٣) بڕوانە: الأعلام للزركلي: (٢٥٥/٥).

## کـۆچـی دوایـی

له مانگی (محرم)ی ساڵی (١٦)ك داو لـه خیلافـەتی (عمـر)دا خـوای لـێ ڕازی بێ کۆچی دوایی کرد، (عمر) خۆی خەڵـکی کۆکردەوە بەمەبەستی نوێـژکردن لەسەری‌و پاشـان نوێژی لەسەر کردو له گۆڕسـتانی (البقیـع) ناشتیان .




مشربة (أم إبراهيم)




نەخشەی گۆڕی دایكانی ئیمانداران لەنێو گۆڕستانی (البقیع)دا

# سەرچاوەکان


١- أحكام الجنائز: محمد ناصر الدين الألباني.

٢- أحكام القرآن محمد بن عبد الله الأندلسي (ابن العربي).

٣- إرواء الغليل: محمد ناصر الدين الألباني.

٤- الإستيعاب في معرفة الأصحاب: ابن عبدالبرّ.

٥- أسدُ الغابة عزالدين أبو الحسن علي بن محمد بن عبدالكريم الجزري، المعروف بـ(ابن الأثير).

٦- الإصابة في تمييز الصحابة: أحمد بن علي بن حجر.

٧- الأعلام: خيرالدين الزركلي.

٨- البداية والنهاية: إسماعيل بن كثير.

٩- تحفة الطالب: إسماعيل بن كثير.

١٠- تفسير القرآن العظيم: إسماعيل ابن كثير، بتحقيق العلامة أحمد شاكر.

١١- تفسير القرآن العظيم: إسماعيل بن كثير.

١٢- تهذيب التهذيب: أحمد بن علي بن حجر.

١٣- تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان: عبدالرحمن بن ناصر بن السعدي.

١٤- جامع البيان عن تأويل آي القرآن: لأبي جعفر محمد بن جرير الطبري.

١٥- الجامع لأحكام القرآن: شمس الدين القرطبي.

١٦- جلاء الأفهام: محمد بن أبي بكر ابن القيم الجوزية.

١٧- جمع القرآن الكريم حفظاً وكتابة: علي بن سليمان العبيد.

١٨- خلاصة الوفا بأخبار دار المصطفى: للشيخ السمهودي.

١٩- دفاع عن الحديث النبوي والسيرة: محمد ناصرالدين الألباني.

٢٠- دلائل النبوة: أبو بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهقي.

٢١- الرحيق المختوم: صفي الرحمن المبارك فوري.

٢٢- زاد المعاد: شمس الدين محمد بن أبي بكر المعروف بابن قيم الجوزية.
٢٣- السلسلة الصحيحة: محمد ناصرالدين الألباني.
٢٤- سنن ابن حبان: محمد ابن حبان.
٢٥- سنن الدارمي: بتحقيق فواز أحمد زمرلي، خالد السبع العلمي.
٢٦- سنن النسائي: أحمد بن شعيب النسائي.
٢٧- سير أعلام النبلاء بتحقيق شعيب الأرناؤوط.
٢٨- السيرة النبوية: إسماعيل بن كثير.
٢٩- شذرات الذهب: عبد الحي بن أحمد العكري الدمشقي.
٣٠- شرح النووي على صحيح مسلم: محي الدين يحيى بن شرف النووي.
٣١- الصارم المسلول على شاتم الرسول: أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني.
٣٢- صحيح ابن ماجة: محمد ناصرالدين الألباني.
٣٣- صحيح البخاري: محمد بن إسماعيل بن ابراهيم ابن المغيرة البخاري.
٣٤- صحيح الترغيب والترهيب: محمد ناصرالدين الألباني.
٣٥- صحيح الترمذي: محمد ناصرالدين الألباني.
٣٦- صحيح و ضعيف سنن النسائي: محمد ناصرالدين الألباني.
٣٧- صحيح مسلم: مسلم بن الحجاج ابن مسلم القشيرى النيسابوري.
٣٨- صحيح مشكاة المصابيح: للتبريزي بتحقيق محمد ناصرالدين الألباني.
٣٩- صحيح و ضعيف سنن أبي داود: محمد ناصرالدين الألباني.
٤٠- الطبقات الكبرى: محمد بن سعد.
٤١- عون المعبود شرح سنن أبي داود: شمس الحق ابادي.
٤٢- فتح الباري بشرح صحيح البخاري: أحمد بن علي بن حجر.
٤٣- فقه السيرة: محمد سعيد رمضان البوطي.
٤٤- كشاف القناع عن متن الإقناع: منصور البهوتي.
٤٥- كلمة الحق: أحمد شاكر.
٤٦- لسان العرب: جمال الدين ممد بن مكرم ابن منظور الافريقى المصرى.
٤٧- لسان الميزان: أحمد بن علي بن حجر.

٤٨- ما شاع ولم يثبت في السيرة النبوية: محمد بن عبدالله العوشن.
٤٩- مجمع الزوائد للهيثمي بتحقيق محمد النجار.
٥٠- المستدرك: محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري.
٥١- مسند الشافعي: محمد بن إدريس أبو عبد الله الشافعي.
٥٢- مسند الإمام أحمد بن حنبل: مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها.
٥٣- مشكاة المصابيح: محمد بن عبد الله الخطيب التبريزي، بتحقيق محمد ناصرالدين الألباني.
٥٤- المعجم الكبير سليمان بن أحمد الطبراني.
٥٥- المعجم الوسيط: إبراهيم مصطفى أحمد الزيات - حامد عبدالقادر -
٥٦- معرفة السنن والآثار: أبو محمد عبدالجبار بن محمد بن أحمد البيهقي.
٥٧- معرفة الصحابة: أبو نعيم الأصبهاني.
٥٨- المفصل في أحكام المرأة: د.عبدالكريم زيدان.
٥٩- المقاصد الحسنة شمس الدين محمد بن عبدالرحمن السخاوي.
٦٠- المنار المنيف: شمس الدين محمد بن أبي بكر المعروف بابن قيم الجوزية.
٦١- موسوعة أم المؤمنين عائشة بنت أبي بكر: د. عبدالمنهعم الحفني.
٦٢- موسوعة فقه أم المؤمنين عائشة، حياتها وفقهها: سعيد فايز الدخيل.
٦٣- الموطأ: الإمام مالك بن أنس.
٦٤- ميزان الإعتدال: محمد بن أحمد بن عثمان الذهبي.
٦٥- النهاية في غريب الأثر: المبارك بن محمد بن محمد بن عبدالكريم أبو السعادات الجزري.
٦٦- الصحيح المسند من فضائل الصحابة: مصطفى العدوي.
٦٧- گولاوى سەرمۆر: وەرگێڕ: بكر حمه صديق عارف.
٦٨- تەفسيرى ڕامان: أحمد كاكە محمود.
٦٩- عائيشه دايكى ئيمانداران لەنێوان دۆستان و نەياران: ئامادەكردنى: پرۆژەى چرا.
٧٠- پوختەى (صحيح مسلم): وەرگێڕانى ليژنەيەك.
٧١- عائيشەى كچى ئەبوبەكر: حبيب محمد سعيد.

# ناوەڕۆک